# ڕۆڤار

ژمارە ٧٤

ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی
تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەکات

سەرپەرشتیار
ڕەووف بیگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
کامەران سوبحان

دەرهێنەری هونەری
ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ
ئارام عەلی

تایپیست
ئارام مەحموود

هەڵەچنی
سەلام مستەفا

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

ژمارەی تەلەفۆن
3120890

Web Site
www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی ئیمێڵی
Rovar.rovar@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

هێڵکارییەکانی ئەم ژمارەیە
هونەرمەند ڕێبوار سەعید





## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەمەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالَح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەمەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەمەد، مەحموود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەمەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحموودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحوی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەمەدئەمین زەکی.

# پێڕست

# عەبدوڵڵا جەوهەر وەک خۆی

## بەڕێوەبەری نووسین

### ڕۆڤار و قەڵەمە لە یادکراوەکان

تایبەتمەندی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار لە چاو ژمارەکانی تردا زۆرە، دیارترین ئەو تایبەتمەندییەشی بۆ ئەو نووسەرە دەگەڕێتەوە کە ڕۆڤارەکەمان بو ئامادەکردووە، ئەم ژمارەیەی بەردەستان تایبەتە بە نووسەر و ڕۆشنبیرێکی نەتەوەییمان کە کەشکۆڵ و گەنجینەی پڕ لە بەرهەم بوو، بەڵام بە بێ دەنگی و هێمنی و دوور لە خۆ دەرخستن کاری کرد و زۆر بەکەمی بەرهەمەکانی چاویان بە چاپکردن هەڵهێنا، هەر ئەمەش وای کردووە ئەم نووسەرە لای نەوەی نوێ وەک پێویست نەناسرێت.!

عەبدوڵڵا جەوهەر، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی کاژیک و خاوەنی ڕۆمانی (بەرەو کوردستان بە مشتێ خاک و خۆڵی هەورامانەوە) چامەی شیعریی (دایە گیان) و (ئاوات) و دەیان نووسین و چیرۆک و وتاری ڕۆشنبیریی و سیاسی ترە، بەڵام تا لە ژیاندا مابوو تەنها یەک کتێبی بڵاوکراوەی هەبوو ئەویش (ئاوات) بوو کە لەسەردەمی پیرەمێرد و لەچاپخانەی ژین چاپ کرابوو، بەڵام ئەو کتێبە تەنها چەند ژمارەیەکی کەمی لێ بڵاوکرابووەوە، ئێمە ژمارەیەکمان دەستکەوت، بەداخەوە چەند لاپەڕەیەکی کەم بوو، ئەمە جگە لە کۆمەڵێکی زۆر وتاری لە گۆڤاری گەلاوێژ پێشتر بەناوی خوازراوەوە بڵاوکرابووەوە، هەرچەندە ئەم نووسەرە یەکێکە لەو نووسەرانەی کە زۆرترین دەستنووسی هەیە، بەڵام بەداخەوە بەشی هەرە زۆریان لەناوچوون و ئێستا لای ماڵباتەکەشی تەنها کەمێکی ماوەتەوە، لەکاتی ئامادەکردنی ئەم ژمارەیەدا بەهۆی بنەماڵە و دڵسۆزان و هاوڕێیانی ئەم نووسەرەوە بەشێکی زۆری دەستنووسی بەرهەمەکانی و وێنە و ئەرشیفی تایبەتیمان دەستکەوت.

چیرۆک و بەسەرهاتەکانی ئامادەکاری ئەم ژمارەیە، شتی سەیرو سەمەرە و ماندوو بوونی زۆری تێدایە، دیارە هەموو کار و پڕۆژەیەکیش بە بێ ماندووبوون تام و چێژی نییە. یەکێک لە خەمە گەورەکانمان بۆ ئامادەسازی ڕۆڤاری ئەم جارەی مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر، وەک ئاماژەمان پێدا لە کەمیی بڵاوبوونەوەی بابەت و کتێب و دەستنووسەکانیدا بوو، پێش چەند ساڵێک لەمەوبەر و لەسەردەمی کارکردنی هاوڕێیانمان (دڵشاد عەبدوڵڵا و یاسین عومەر) زۆر هەوڵدرا ئەم ژمارەیە دەربکەن، بەڵام دەستکەوتنی بەرهەم و دەستنووسەکانی ئەو نووسەرە گرفتێکی گەورە بوو لە بەردەم دەرچوونی ئەو

ژمارەیەی ڕۆڤاردا، ئەمە جگە لە دۆزینەوەی نووسەرانی نزیکی عەبدوڵڵا جەوهەر و هاوڕێیانی سەردەمی ئەو، یەکێکی تر بوو لە لەمپەرەکانی بەردەم ئەم ژمارەیە، بەڵام بەخۆشحاڵییەوە ئێمە لە کارکردن بەردەوام بووین تا دوا بڕیاری دەرکردنی ئەم ژمارەیەماندا.

بۆیە ئێمە سەرفرازین کە ژمارەیەکی ڕۆڤار بۆ ئەم نووسەرە نمونەییەی نەتەوەکەمان دەربکەین کە بەداخەوە تا ئێستا وەک پێویست لەلایەن ناوەندی ڕووناکبیریمانەوە بەسەرنەکراوەتەوە، بەهیوای ئەوەی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار سەرچاوە و گەنجینەیەکی دەوڵەمەند بێت بۆ کتێبخانە و خوێندەوارانی کورد.

ماوەی دوو مانگ بەبەردەوامی بە بێ پشوودان لە کێومالکردن و گەڕان و پرسیارکردنداببووین بۆ دۆزینەوەی وتار و بابەت و دەستنووس و ئەو کەسانەی دەتوانن لەسەر ئەم نووسەرە بنووسن، لە ئەنجامدا لەسەرووی چاوەڕوانییەکانی ئێمەوە توانیمان بە شەونخونی هەموو لایەک ڕۆڤارێکی نموونەیی دەربکەین، کە پێمان وایە ئەم ژمارەیە لەچاو ژمارەکانی تری ئەم خولەدا ژمارەیەکی نموونەییە و پڕ لە زانیارییە لەسەر سەربازێکی ونی دنیای ڕوناکبیری و سیاسیدا.

## ڕۆڤار و بەرهەمەکانی تری عەبدوڵڵا جەوهەر

هەر چەندە ئامادەسازییەکانی ئێمە بۆ دەرکردنی ڕۆڤارێکی شایستە بۆ مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر لائاسایی بوو، بەڵام بەپێی کارکردنەکانمان پرۆژەکە هەر لە دەرکردنی ژمارەیەکی تایبەتدا نەوەستا، بەڵکو وەک ئاماژەمان پێدا کارەکەمان بوو بە پرۆژەیەکی گەورە، ئەویش بەدەر لە بڵاوکردنەوەی ڕۆڤار دوابەدوای ئەم ژمارەیە ئەم کارە گەورەبکەین بە سێ بەرگ (چامەی شیعریی دایە گیان، ڕۆمانی (بەرەو کوردستان بە مشتێ خاک و خۆڵی هەورامانەوە)، بەشێکی زۆر لە وتارە بڵاوکراوەکانی (عەبدوڵڵا جەوهەر) بڵاودەکەینەوە، بۆ ئەم پرۆژەیەش بەتایبەتی بۆ بەشێک لە وتارە بڵاوکراوەکانی عەبدوڵڵا جەوهەر بەناوی خوازراوەوە پێشتر نووسەری خوالێخۆشبوو (ئومێد ئاشنا) کۆی کردبوونەوە، خۆشبەختانە ئەم پرۆژەیەش بوو بە بەشێک لە کارکردنەکەی ڕۆڤار و بە هاوکاری و هاوبەشی (بنکەی ژین) توانیمان. ئەمەش دەرفەتێکی باش دەدات بە خوێنەران و نەوەی نوێ، بۆ ئەوەی لەم نووسەرە بگەن و ئاستی توانا و داهێنانی لە بواری نووسیندا ببینن، لەکاتی خوێندنەوەی ئەو ڕۆمان و چامە شیعریی و وتارانەی عەبدوڵڵا جەوهەردا کە بەشێکیان پێش نیو سەدە لەمەوبەر نووسیوویەتی، خوێنەر هەست بە توانای زمانەوانی و ئاستی تەکنیکی نووسین و ئەو هێزە گەورەیەی دەکات کە ئەو لەو سەردەمەدا هەیبووە، بەتایبەتیش لە پاراویی زمانە کوردییەکەیدا.

دیارە ئەو بەرهەمانەی ئەم نووسەرە کە لەم کتێبەدا کۆکراونەتەوە، سەرجەم بابەتی ئەو نین، چونکە عەبدوڵڵا جەوهەر، کۆمەڵێکی زۆر دەستنووسی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە کە خۆی لە وتار و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و نیشتیمانی و پرسی وەرگێڕان و شتی لەو بابەتەدا دەبینێتەوە، بۆنموونە فەرهەنگێکی (ئینگلیزی-کوردی) هەیە بەناوی (هەندێ دەنگی نامۆ لە زمانی کوردیدا) ئەم فەرهەنگە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا دەستی بە نووسینی کردووە و بەداخەوە مەرگ ڕێگەی نەداوە تەواوی بکات، ئێمە لەم ژمارەیەی ڕۆڤاردا بەشێک لەو وشە و زاراوە کوردییانە بە هەردوو زمانی کوردی و ئینگلیزی بڵاودەکەینەوە. ئەمەش دەبێتە یەکەمینجار کە خوێنەری کورد بزانێت عەبدوڵڵا جەوهەر سەرقاڵی فەرهەنگێکی وا گەورە بووە بۆ بەراوردکاری زمان و زاراوە لە نێوان زمانی ئینگلیزی و کوردیدا.

## عەبدوڵڵا جەوهەر لە فیلمێکی دۆکیۆمێنتەریدا

لە سەروبەندی ئامادەسازی بۆ ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار، ئایدیای ئەوە دروست بوو، چیرۆکەکانی ئەم ژمارە و ژیننامە و بەرهەم و لایەنە شاراوەکانی عەبدوڵڵا جەوهەر بکرێتە فیلمێکی دۆکیۆمێنتەری سینەمایی، خۆشبەختانە دوای باسکردنی بیرۆکەکە، هەردوو فیلمسازی دۆکیۆمێنتەری (خەسرەو حەمەکەریم، محەمەد قادر) دەستیان بەکارەکە کرد، فیلمەکە بە دوو هێڵ کار دەکات، یەکەم هێڵی کارکردنی ئێمەیە لە ئۆفیسی سەردەم و چۆنیەتی ئامادەکاری بۆ ڕۆڤارەکەی عەبدوڵڵا جەوهەر، دووەم هێڵی فیلمە دۆکیۆمێنتەرییەکە، کارکردنە لەسەر بەرهەم و ژیان و لایەنە شاراوەکانی ئەو نووسەرە، بۆ ئەو فیلمەش چەندین ڕۆشنبیر و هاوڕێ و کەسانی دڵسۆز هاوکاریی بەرهەمهێنانی دەکەن، چاوەڕێی کارێکی هونەریی باشین، خەرمان بەرەکەت.!

ئەمەش خاڵێکی تری جیاوازی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤارە لە ژمارەکانی پێشووتری، بە هیوای ئەوەی توانیبێتمان بەم ڕۆڤار و بەرهەمانەی ئەم نووسەرە کوردە لانی کەم بەشێک لە گەورەیی و لایەنە شاراوەو نادیارەکانی بە خوێنەرانی کورد ئاشنا بکەین.

## وێنە و نامە بڵاونەکراوەکانی عەبدوڵڵا جەوهەر

یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی ئەم ژمارەیە، لەو ئەلبومە وێنەییەی عەبدوڵڵا جەوهەردایە، کە بەشێکی زۆری وێنەکانی بۆ یەکەمینجارە دەبینرێت و بڵاودەکرێتەوە. دیارە ئەم وێنانەش لە سەرچاوە و لە شوێنی جۆراوجۆرەوە دەستگیربووە و خاوەندارێتی فەرمی بۆ ڕۆڤار دەگەڕێتەوە، هەر لەکاتی ئامادەسازی ئەم ژمارەیەدا کۆمەڵێکی زۆر نامە و دەستنووسی تایبەتی عەبدوڵڵا جەوهەرمان دەستکەوت، بەڵام بەشێکی زۆریان بۆ ئەم بارودۆخە ڕامیارییەی ئێستا ڕەنگە بڵاوکردنەوەی زۆر لە بار نەبێت، لەبەر ئەوەی زۆر بە ڕاشکاوانە ڕەخنەی لە هەندێ کارەکتەری سیاسی کورد گرتووە کە ڕەنگە زمانەکەی و شێوازی نووسینەکەی بۆ ئێستا نەگونجێت. لەبەر ئەوە ئەو نامانەمان لە ئەرشیفی تایبەتی خۆمان پاراست، بۆ ئەوەی بڵاوکردنەوەی نەبێتە هۆی لەکەدارکردنی کارەکتەری هیچ کەس و لایەنێکی دیاریکراو. بەڵام ئەوەندە هەیە ئەم نووسەرە نەتەوەیی و بوێرە پێش چل ساڵ لەمەوبەر ڕەخنەی لە سیستمی حیزبایەتی کوردی و شێوازی بەڕێوەبردنی جەماوەریی و گروپ و چالاکی سیاسیی گرتووە.!

وەک وەفایەک بۆ ئەو پیاوە و کارەکەی، دەبێت ئەو ڕاستییە بڵێین کە ڕەخنەکانی چل ساڵ لەمەوبەری مامۆستا جەوهەر لە سیستمی حیزبایەتی کورد و شێوازی بەڕەێوبردن، داکۆکیکردنە لە داواکارییە ڕەواکانی جەماوەر کە لە ئێستادا هەمان ئەو پرسیارە و گومان و ڕەخنانەن کە لە ناوەندە سیاسی و ڕوناکبیرییەکەدا سەنتەری گفتوگۆ و بۆچوونی جیاوازن.

# عەبدوڵڵا جەوهەر کێیە؟

عەبدوڵڵا جەوهەر






**جەلالی حاجی دەرویش ***

(عەبدوڵڵا تۆفیق ئاغای جەوهەر ئاغای سلێمان ئاغای مێوڵییە) لەساڵی ١٩٢٠ لە ئاوایی (مێوڵی) لەناوچەی قەرەداغ هاتۆتە دنیاوە و لە ئێوارەی ڕۆژی سێ شەممەی ڕێکەوتی ١٩٨٢/٦/١ بە نەخۆشی شێرپەنجەی گەدە لەشاری سلێمانیماڵئاوایی لە ژیان و دۆستانی کرد. خۆی تاقانە و سێ خوشکی هەبووە بەناوەکانی (ئەجیە – قومری – نەسرین) ئێستا هەر قومری خان لە ژیاندا ماوە. عەبدوڵڵا جەوهەر بەڕەبەنیی ژیانی بەسەر برد.

ساڵی ١٩٣٨ بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی ڕوو لە شاری کەرکوک دەکات، هەر لەو ساڵەدا لەگەڵ دڵداری شاعیر و خوالێخۆشبوو نوری شاوەیس و چەند کەسێکی تر، هاوبەشیی لە دامەزراندنی (کۆمەڵی دارکەر)ی قوتابیاندا کردووە، عەبدوڵڵا جەوهەر سیاسەتمەدارێکی کوردی هوشیار و بە توانا و دڵسۆز بوو، یەکێکە لە دامەزرێنەرانی هاوچەرخترین حیزبی نەتەوەیی کورد (کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوە و یەکێتی کورد (کاژیک) لە دایکبوونی ئەو حیزبە نەتەوەییە مرۆڤانەیە، شۆڕشێکی مەزنی بیری هاوچەرخانە و هەڵوێستی شارستانانەی دەگمەنە، لە تێزی چالاکی سیاسی و جۆری ڕێکخستندا پرۆسەیەکی نوێی داهێنەرانەی بەرپاکرد و بیروباوەڕی نەتەوەیی کورد (کوردایەتی) ی لە بۆتەیەکی زانستیانەدا داڕشت، کە ڕەنگدانەوە و کاریگەری ڕاستەوخۆی بەسەر بەدیهێنانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و کەشی ئێستای ئازادی و ئایندەی ڕووناکی کوردەوە هەیە..

هەردی شاعیر، چەندین جار لە چاوپێکەوتن و کۆڕ و سیمینارەکانیدا فەرموویەتی: بە خامەی عەبدوڵڵا جەوهەر ڕەشنووسی "کاژیکنامە" داڕێژراوە.. ئەوەش بەڵگەی بەهرەی داهێنانی نوێی عەقڵی کراوەی ئەو مرۆڤەیە، ژیانی عەبدوڵڵا جەوهەر ئاسایی نییە و چەندین وێستگەی گرنگی لە خۆ گرتووە، هەر وێستگەیەک لەو وێستگانە پڕییەتی لە وانە و پەندی گرنگ، لە سەرەتای نووسین و بڵاوکردنەوەشیدا

هەر لەساڵی ١٩٣٨ بەیارمەتی (پیرەمێردی نەمر) کۆمەڵێک هەمەڕەنگ (لە شیعر و چیرۆک و بابەتی وەرگێڕراو) بەناوی (ئاوات) لە چاپخانەی (ژیان) لە سلێمانی بەچاپ دەگەیەنێت، بەڵام بەهۆی ناحەزانەوە لە چاپخانە دەستی بەسەردا گیراو بڵاونەکرانەوە. لەساڵی (١٩٣٩ تا ١٩٤٩ لە گۆڤاری (گەلاوێژ) نووسینی بڵاوکردەوە بەناوی (ع. چالاک) و (جیم) ، (ع .جەوهەر) و بەرهەمەکانی بریتیبوون لە (پەخشانی هونەریی و کورتە چیرۆک و بابەتی ڕەخنەیی ئەدەبی)

کە خۆی لەژیاندا بوو (کتێب و گۆڤارێکی) زۆری بەخشی بە کتێبخانەی گشتی سلێمانی و شوێنێکی تایبەت هەیە لەوێ بەناوی (کتێبخانەی عەبدوڵڵا جەوهەر).

وەک پیشەی فەرمانبەرییش لە ١٦-٩-١٩٤١ بۆ یەکەمینجار بە نووسەری خەزێنە لە فەرمانگەی موتەسەڕیفی سلێمانی دامەزراوە، دواتر بە فەرمانبەری نووسەری چاپ لە ٢٢-٧-١٩٤٥ گوێزراوەتەوە بۆ فەرمانگەی تەسوویەی سلێمانی، پاش ئەوەش گوێزراوەتەوە بۆ بەڕێوبەرایەتی پەروەردەی سەرەتایی سلێمانی، وەک ژمێریاریش لەوێ ماوەی چەند ساڵێک کاری کردووە، تا دواجار لە ٢٠-١-١٩٥٨ گوێزراوەتەوە بۆ ئامادەیی کشتوکاڵی بەکرەجۆ، لەوێ درێژەی بە پیشەی فەرمانبەریی داوە و لە ڕۆژی ١٩-١١-١٩٦٤ خانەنشینکراوە.

دوای کۆچکردنی عەبدوڵڵا جەوهەر، بنەماڵەکەیان چی کتێب و گۆڤاری هەبووە بەخشیویانەتە کتێبخانەی مۆزەخانەی سلێمانی کە کۆی کتێبەکان ١٦١٣ کتێب بوو، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری گۆڤاری کۆن و دانسقە، ساڵی ١٩٨٣م بەژمارەی کتاب ٤٦ لە ١٩٨٣/١/٢٢. و دوای وەفاتی چەند نووسینێکی جێهێشتووە کە دەستنووسە. لەوانە:

ڕۆمانێک بەناوی (بەرەو کوردستان بەچنگێ خاک و خۆڵی هەورامانەوە) پایزی ١٩٦٠ نووسیویەتی، (دایە گیان) ڕەشەمێ تا پووشپەڕی ساڵی ١٩٤٨ نووسیویەتی.

* هەندێ دەنگی نامۆ لە زمانی کوردیدا، فەرهەنگێکی زمانەوانیی کوردی-ئینگلیزییە، بەڵام مەرگ ڕێگەی نەداوە ئەم فەرهەنگە دانسقەیە تەواو بکات.

* جگە لەم کتێبانەش، دایکم دەیگێڕێتەوە کە جارێکیان لەکاتی ڕەشبگیریی زەعیم سدیق دا، لە ترسی پیاوەکانی زەعیم سدیق و ئەو ڕەشبگیرییەی کە لە سلێمانی دەستیان پێکردبوو، کۆمەڵێکی زۆر دەستنووسی خۆی سووتاندووە.

ڕۆژی مردنەکەشی کە لە ڕۆژی ١-٦-١٩٨٢ بوو دوای ململانێیەکی زۆر لەگەڵ نەخۆشیدا کە هەواڵەکەی بڵاوبووەوە، جۆرێک لە ماتەمینی باڵی کێشا بەسەر شاری سلێمانیدا، پرسەکەی لەبەر قەرەباڵغی، لە مزگەوتی گەورە بۆی دانیشتن، هەرچەندە ئەو پیاوێکی ڕەبەن و کەمدوو، هێمن و پەیوەندیی کۆمەڵایەتی زۆر نەبوو، بەڵام بە یەکێک لە پرسە زۆر قەرەباڵغەکانی شاری سلێمانی ئەژمار دەکرێت، لە بەر ماتەمگێڕان ڕێگەی کەس نەبوو، سەدان ڕۆشنبیر و نووسەر و هونەرمەندی ئەو کاتە کە خۆیان بە قوتابی خاڵم دەزانی لە پرسەکەیدا بە پێوە وەستابوون.

دەمەوێت لە کۆتاییدا ئاماژە بەوە بکەم، کە ئەم دەستنووسانە ئێمە وەک بنەماڵەی عەبدوڵڵا جەوهەر لەدوای مردنەکەی پاراستوومانە و چەند کەسێکیش لە بنەماڵەکەی لە ترسی فەوتان هەریەکەیان چەندینجار بە دەستنووس نووسیومانەتەوە، بۆ ئەوەی لە ترسی لەناوچوون بیپارێزین.

***خوشکەزای عەبدوڵڵا جەوهەر**





## دوو دەقی شێرکۆ بێکەس بۆ عەبدوڵڵا جەوهەر



# عەبدوڵڵا جەوهەر
# قەڵەمێکی ڕەنگین و
# گۆمێکی مەنگ

١٩٨٢



شێرکۆ بێکەس

# عەبدوڵڵا جەوهەر
# سەرتاپا گزنگ..
# سەرتاپا گەوهەر!

٢٠١٣

# عەبدوڵڵا جەوهەر قەڵەمێکی ڕەنگین و گۆمێکی مەنگ

کەهاتین بۆ لات، دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ بوو، تۆش لە ئێوارەی ژیاندا بووی. دوا زەردەپەڕی خۆرنشینێکی کاڵی خەماوی، لە شووشەی پەنجەرەکەوە بە کزی خۆی ئەکرد بەم دیودا و بەهێواشی ئەچووە سەر کلووی قژە سپیەکەت. بەفری بەر مانگەشەوی هاوینی بێ سرپە و چرپەی ملە بەرزەکانی ئەم وڵاتەیان هێنایەوە پێش چاوی خەیاڵم.
تەمی سەر و خوار گرتووی ئاسۆی پێش ئەنگۆرە، پێش ئاوابوونی یەکجاری، چۆن لە دامێنی تەڕی چەمەکانەوە دەواری خۆڵەمێشی خۆی هەڵئەدا و بەرەو لاپاڵەکان هەڵئەکشێت، تەمێکی ئاوا لە چەناگە بچووکەکەت و دەم و چاوە ورد و ئێسک سووکەکەت نیشتبوو.
کە ئێمەت دی، زەردەخەنەیەکی هەڵوەریو وەک زەردەخەنەی تاڵ و بەناسۆری درەختێکی ڕووتی پانزەی نێو خەزان، وەک بزەی گۆپکەیەکی داڕنراو، کەوتە سەر بەیبوونی وشکی لێوەکانت. بۆ ساتەوەختێ هەر ئەوەندەی چاو تروکانێ، کەمتر لەوەختی بەیەکدادانی باڵی نەرمی پەپوولەیەک، کەمتریش لە پلی لێدانی دڵی چۆلەکەیەک، گەشایتەوە و ئیتر لەپڕێکدا چۆن فوویەک لە گڕی کز کراوی چرایەک ئەکرێت، ئاوەهاش زەردەخەنەکەت کوژایەوە، لەسەر پشت ڕاکشابوویت، ژوورەکەت بۆنی مردنی لێ ئەهات، ئەو چاوە بچووکانەی کە تا دوێنێ بوو لەژێر دوو برۆی تەنکەوە، وەک دوو ئاگردان پریشکی زرنگیی و هوشیارییان لێ ئەبۆوە، وا ئێستا پشکۆی گلێنەیان دامردۆتەوە.
دوو ئاوێنەی تەم گرتووی شەوق لێ براون و دوو گوڵە حاجیلەی سیس. لەسەر پشت ڕاکشابوویت، لە لقەدارێکی زامداری دوای برینەوە ئەچوویت. نیگای لێڵ و پێڵت لە شوێنێکی نادیارەو چەقیان لەوێدا بەستووە.
لە مەرگ ورد ئەبوویتەوە. خۆت دابوو بەدەم دوا شەپۆلی سەرەو نگووم بوونێکەوە، کە دۆزینەوەی لەدوا نەبێ ئەتزانی لە ئان و ساتدایە گێژەنی مەرگ بەرەو بن ڕاپێچت بکات. ئەتزانی وردە وردە لێت نزیک ئەبێتەوە و لە دواییشدا ئەتگرێتەوە باوەشی ئەبەدی خۆی.
لەسەر پشت ڕاکشابوویت، هاوارێکی بێ دەنگ بوویت،




**پشتەوەی ئەو وێنەیەی کە شێرکۆ بێکەس لە ١٩٦١/١/٤ پێشکەشی عەبدوڵڵا جەوهەری کردووە**

ئەوەتا دەمی ئازارێکی تیژ ناوسکت ئەنجن ئەنجن ئەکات، برینەکان شەقارن و وردە شووشەیان تێ کراوە، بەڵام بێ دەنگ ئەمردی، لە مردن نەئەپاڕایتەوە، زۆرت لە زامەکانت ئەکرد و دەمیانت ئەبەست بۆ ئەوەی نەزریکێنن و ورە بەرنەدەن. لەو سەرەمەرگەشدا، هەر بێ دەنگیی و هێمنیی و ئارامت خۆش ئەویست. ئازاری بە سوێی جەرگ بڕت لەژێر لێوکرۆشتنێکی قایمدا دابین ئەکرد، مردنی شێنەییت هەڵ ئەبژارد، تۆ بە درێژایی تەمەن هەر شەماڵێکی شێنەیی بوویت، هەر گۆمێکی قووڵ و مەنگ و ڕەگێکی جیڕ بوویت، تۆ گوڵە هێرۆیەکی سەرلق سپی بوویت و بەرز ئەتڕوانی، لە درەختێکی تەنیای سەر پەڕگرتووی تەریک ئەچوویت، سێبەرێکی کڕت هەبوو، بەڵام هەموو کەس نەئەگەیشە لات، لە نەهێنی چڕ و پڕت نەئەگەیشتن، لە دەوروبەری پڕ لە ڕیا و ڕیاکاری، مانێکی تایبەتیت گرتبوو.
دڵت ئاسکێکی سڕ بوو نەئەگیرا، سروشتی تایبەتیت ئەسپێکی کێوی بوو ڕاو نەئەکرا. تۆ نوێژێکی تایبەتیت بۆ خۆشەویستی کوردستان ئەکرد و لە نوێژی جگەر سۆزانی تر نەئەچوو. ئاوێنەی خۆت هەبوو لە ئاوێنەی



هیچ کەسێکدا تەماشای خۆت نەئەکرد.
گیانت پەپوولەیەکی باڵ نەخشین بوو، هەموو ڕۆژێ بە سێبەر و هەتاوی ئەم شارەدا بە هێوری ئەفڕی و هەر بە هێوریش ئەنیشتەوە.
تەمەنی تۆ هەمووی {ئەسپایی} بوو وەک هەموو ئەسپاییە جوانەکانی ناو سروشت. دەم و دووت، هات و چۆت، گوێ گرتنت، خوێندنەوەت، نووسینت، تەنانەت هاواری بێزاریشت هەر ئەسپایی بوو.
تۆ لەم سەردەمە ئاڵۆزەدا گیانی فریشتەییت لە ئامێز گرتبوو، لەسەر پشت ڕاکشابوویت، نە هاوسەرێک هەبوو سبەینێ بە بەفری قژتەوە، نە جگەرگۆشەیەک سەری باوکێتی بنێ بە دڵیەوە.
تۆ و تەنیایی هاوڕێی گیانی بە گیانی بوون، هەمیشە قۆڵتان لە قۆڵی یەکدا بوو، ئەوت بە هاوسەر هەڵبژاردبوو، لە ماڵێکی چۆڵ و کپ و خامۆشدا، کە لە جریوە و جووکەی چۆلەکە و وژەی لەرینەوەی لق و پۆپی درەختەکان بەو لاوە، دەنگێکی تری لێوە نەئەهات، لەوێدا تۆ و تەنیایی، تۆ و خەمی جگەرگۆشەکەت، پێکەوە ئەژیان ڕووت تێ ئەکردن.
لەسەر پشت ڕاکشابوویت، بەدەم گینگڵەوە ئەلبوومی یادگارییت هەڵئەدایەوە. دەستی ڕاستت خستبووە سەر پۆشمینەکە، پەنجە باریک و لاوازەکانت لە پەلکە گیای وەرزی باران بڕان ئەچوون، ئەوەتە ئێستە زەردبوون و لە بریق و باق کەوتوون. پەنجەکانت ئەو پەنجانەی ڕۆژانێ بوو قەڵەمێکی ڕەنگینیان ئەگرت و ملوانکەی بەهرەیان ئەکردە مل.
ڕۆژانێ بوو ئەو پەنجانە پەلکە ڕەنگینەی {پەخشان} یان لە پێشوازی {گەلاوێژ}دا ئەکرد بە تاقی سەلیقە و بە چلچرای بیر ئەیانڕازانەوە، لە ئاسمانی ئەودا ئەدرەوشانەوە و جریوەیان ئەهات و خەوی ڕەنگاوڕەنگی خۆشیان ئەبینی و گوڵاو پرژێنی پرچەکانی ئەویان ئەکرد، ڕۆژانێ بوو ئەو پەنجانە ئاوێزانی ئەم زمانە کوردییە شیرینە بوون.
کانیاوی بەهرە ئەبوو بە جۆگەی ڕوون و ڕەوانی بەرهەتاوی زنوێران و ئەڕژانە ڕووباری ئەدەبیاتی سەردەمی تازەمانەوە. قەڵەمەکەت لە قەڵەمە پێشڕەوەکانە، ئەو قەڵەمانەی لە ڕۆژگارە تاریکەکاندا چراوگ بوون، دڕیان بەدیواری شەوی ئەمووستەچاو ئەدا. گوڵبارانی ئەدەبی نوێ بوو، گوڵەکانی تۆش لە گوڵە دەگمەنەکان بوون. ڕاکشاویت و نیگای خەیاڵت پێڵوی تەڕیان ئەکەن بە باڵ. لە سەردەمی لاوێتیشدا تۆ هەر کەنارت گرتبوو، کۆترەباریکەکەی دەنگ خۆشی تەریوت بوویت. لە جۆشی



تەمەندا، لە هەرەتی قوڵپدانی خوێنی بەهرە و نووسیندا بە پێچەوانەی ئاوەڵەکانتەوە حەزت نەئەکرد بەهرەکەت بکەیتە ئاڵا و لەبەرچاوان بشەکێتەوە، لەو قۆناغەشدا ڕقت لە لاپرەسنگی و خۆدەرخستن ئەبووەوە.

نازناوی (ع. چالاک)ت بۆ خۆت کرد بە نیشانە، گەلاوێژت کرد بەجێ نزرگە، لەم ساڵانەی دواییشدا کە کوڕ و کاڵانی ئەدیب و ئەدەبدۆست ئەهاتنە لاتەوە و لە بەرهەمی ئەو سەردەمەت ئەدوان، تۆ خۆت نەئەکرد بە خاوەنیان، بە هێوریەکەی خۆت دەستێکت ڕائەوەشان و ئەتوت {هی من نین، کوا من ئەدیبم؟}.

تۆزقاڵێ گیانی خۆشەویستی و چاوچنۆکی و خۆبەزل زانین لەتۆدا نەبوو. لەکاتێکدا ئەگەر بتویستایە قەڵەمەکەت بە ئاشکرا تاو بدەیت، چەپکە گوڵەکانت بێنیتە ناو کۆڕەوە و ڕیزیان بکەیت، دڵنیام ئەوسا قەڵەمەکەت پێش زۆر قەڵەم ئەکەوت، گوڵەکانیش بازاڕی ڕەونەقی زۆریان ئەشکان، چ گیانێکی سادە و بەفرینی پاکت هەبوو.

زۆربەی هاوڕێکانی ئەم ساڵانەی دواییت، ڕەش و ڕووت و بێ کار و خەڵکە سادە و ساکارەکانی شارەکەم بوون، ئەوانت زۆرتر ئەدواند، ئەوانت لە خوێندەوارە درۆزنەکان خۆشتر ئەویست.

لەسەر پشت ڕاکشابوویت، منداڵیی خۆت ئەلاواندەوە.

ئەی دارستان و قۆپی و کاوان و لێرەواڕ و کانیاوەکانی قەرەداغ چاوی تۆیان نەڕشت؟ ئەی ئەو بیرەوەری و سەرگورشتە و بەیت و گۆرانییە میللییانەی قەرەداغت نەکردووە بە کۆمەڵێ تابلۆی ڕەنگین و هەڵت نەگرتوون؟ ئەی لاوانەوە بەسۆزەکەی — دایەگیان — هەر بۆن و بەرامەی {باخان}ی قەرەداغ و سنگ و بەرۆکی دایکانی ئەوێی لێ نایەت؟!

هێشتا قوتابییەکی لەڕ و لاوازی مل باریکی گۆشەگیری منگ بوویت، کە بەهرەی قەڵەمەکەت چاوی تیژی {پیرەمێرد}ی گەورەی قۆستەوە هات بە پیرتەوە، بەهرەکەتی گرتە باوەش، لێی وردبووەوە، گەش بووی، تۆ ئەوساش هەر شەرمنێکی سەرکز و بەڵام دڵ وریا بووی. {پیرەمێرد}ی باوک دەستی بەسەرە بچووکەکەتا هێنا، بەرهەمەکەتی خستە سەر دڵ، تۆ بڕوات نەئەکرد، نۆبەرەکەت ناونابوو {ئاوات}، پیرەمێردی کەڵە شاعیر، بەدەستی ڕەنگینی خۆی هەر لە چاپخانە دێرینەکەدا لە چاپی دا.



لەوەدا بوو — ئاوات — ئاواتی نۆبەرە بە هەنگاوی گەورەوە بچێتە ناو کۆڕ و کۆمەڵانی خوێندەواری ئەو سەردەمەوە، بەڵام لەپڕێکا ڕێگەیان پێ گرت. ڕاپۆرتنووسانی دەسەنەخۆری ئینگلیز، مڵە و دووپشکەکانی ناو باخی ئەدەبیاتمان، جرۆجانەوەر ڕموزنەکان بە خەنجەری ڕووتەوە گەیشتنە سەر نۆبەرەی ئاواتی جەوهەر و لە بەردەمی پیرەمێرد دا سەریان بڕی.

لەسەر پشت ڕاکشاویت، زەرد، زەرد، زەرد، زەرد، هەر ئەڵێی مانگی کوژراویت، لە ناوەوە ئازار ئەڕوا و ئەتکێڵێ، تۆ کێڵگەی زات و ورەی لەناو چنگی ئەختەبووتی هەزار پەلی {سەرەتان}دا لوول ئەخۆیت و هاوار ناکەی.

چ ورەکی بەسامی و چەندە ئارامێکی گەورەی.

لەسەر پشت ڕاکشاویت، دەنگت لەناو هەناسەی سواردا خنکاوە.

ئەی {جەوهەر}ی ڕەوشت، ئەی گوڵە هێرۆی لاسک شکاوەی مل بەلارەوە گرتوو، بۆ یەکەمجار لە چاپخانەیەکی پەڕپووت و بچووکی شارەکەمدا یەکترمان ناسی، بۆ دواجاریش بەرلەوەی ئەم دەردە گرانە لە پەل و پۆت بخات، هەر لە چاپخانەیەکی وادا لەیەکتر جیابووینەوە.

لەسەر پشت ڕاکشاویت، ڕووە ژاکاوەکەت لە منە، پار ئەم وەختە بوو، دیسانەوە سەرم کردەوە سەرت، مەنگیتم شڵەقاند، بەڵام لێڵم نەکردی، ئەمزانی تۆ ماسییەکی ئەم گۆمی شینی ئەدەبەیت و بێ ئەو ناژیت، ئەمزانی کە شەو دادێ و دنیا ئەنوێ، تۆی شەیدا لەگەڵ وشەدا ڕۆژ ئەکەیتەوە و بێ دەنگ ئەسووتێیت، بێ دەنگ ئەگریت و خەڵوەت جێ ناهێڵی!

بیست ساڵ بوو ئەمناسیت، بەدەم پێت نەوتووم، بەڵام چاوت بە ئاشکرا ئەیدرکان کە خۆشت ئەوێم، چاوت ئاوێنەیەکی بێ گەردی ڕاستگۆیی بوو.

دەستت نەنا بەڕووی داواکەمەوە. چەند بەرهەمێکی لەکونی هەتیتەدا هەڵگیراوت بۆ هێنام، سێ دەفتەر، چەند ڕۆژێ لەگەڵیانا ژیام، چەند ڕۆژێ بە بادەی زمانی شیرینی ئەوان مەست بووم. نووسینەکانیشت وەک خۆت ناسک بوون، وەک خۆت کەم دووی پوخت و پاک بوون، قەڵەمی ناوبەناوی ڕەخنەشت وەک ڕەوشتی خۆت بەرزبوون، زمانی تەڕ و پاراو و نەوازەی بێ گرێ و گۆڵ، سفت و ڕەوان درەوشاوە بە قسەی نەستەقی باو و باپیران خۆش کراو. ڕستەی کوردانەی پتەو داڕێژراو، دڵی منیان لە زووەوە کەمەندبەند کردبوو. کتومت وەک خۆشەویستی داربەڕوو و ئاوی ئەم کوردستانە. لەسەر پشت ڕاکشاویت وا چاوت لێک ناو ئاوا بوویت. دە ماڵئاوا، ئەی قەڵەمە ڕەنگینەکە، تۆ لە گوڵدانی دڵمای، ئەمجارە لەوێدا ڕاکشێ.

**شێرکۆ بێکەس ١٩٨٢**

# عەبدوڵڵا جەوهەر
# سەرتاپا گزنگ.. سەرتاپا گەوهەر!

*

وەختێ ئەدوا.. شنەبایەک لە دەنگیا بوو
لە ئەسپایی ئەسپاییتر.. نەرم نەرم ئەهات ئەیدا
لە پەڕەی دڵ و پەردەی گوێ.. وەختێ ئەدوا.
وەختێ ئەڕۆیشت.. لە جۆگەی ڕوونی بێ خوڕەی
بەر سێبەری نزارێکی کش و مات و هەنگاونانی
لە هەنگاوی هەتاوێکی بەکاوەخۆی بەیانیانی
بن بنار و ناو تەلان و لاپاڵ ئەچوو.



کە دائەنیشت.. کورسی ژێری دوای چەند چرکە
پێی ئەزانی کە لە سەری دانیشتووە!.
کە هەڵئەسا.. پێی ناخۆش بوو..
ئەو گوڵی سپی لۆکەیە بۆچی ئەڕوا.

باریکەلە.. وەک تاژانی دارچنارێ
کە هەر ئەوەندەی بتوانێ لە ڕاڕەوی
مانگەشەوێکی زۆر تەنگدا بێت و بچێ.

قسەی فێنک.. وەک ڕێ ڕەوی قەیسەریەکان
لە هاویندا.. گەرمیش وەکوو قسەی خۆشی
دەوری زۆپای سوورەوە بوو لە زستاندا.

دەم و چاوی وردیلانە. لووتی بچووک
گونجاو لەگەڵ دەم و لێوێکی باریک و دەم و لێویش
گونجاو لەگەڵ چەناگەیەکی بچووکدا.. هەردوو چاویش
پڕ لە تەماشای قووڵ قووڵ و پڕ گزنگی زیرەکانە.

وەک ڕانک و چۆغەکەی بەری سادە.
سادە وەکوو سەماوەر و قۆری و پیاڵە و
باوەشێن و شەکردانی هەردوو چایخانە گچکەکەی
مام ساڵح و وەستا شەریف. سادە وەکوو کلووی بەفر.
دەنکە تەرزە. یان پەپوولەی تاک و تەرای
خلەوەبووی پاییزانە.

به ڕواڵەت. وەک بوارێکی زۆر تەنک.
کە منداڵێک پێی بوێرێ و خۆی لێبدا.
بەڵام ئەو وەختەی کە بوار ئەیبردینە ناو خۆیەوە و
وەک گێژاوێ، زەینی تیژ و، پڕۆپۆی ڕووناکیی هزر و،
زانیاری زۆر قووتی ئەداین.. ئەوسا ئیتر ئەمانزانی
لەکوێی ئەم بەحرە قووڵەداین.

کتێبێ بوو، نزیکەکانیش زۆر گران، هەندێ دێڕیان
لێ خوێندەوە. بەڵام ئیتر هەموو پەڕەکانی ئەم کتێبە،
هەڵنەپچڕاو، دوو دوو بەیەکەوە نووساو. خودا چۆنی
چاپکردبوون، وایش مانەوە.

پرسیار بوو لەناو پرسیاردا. گومان بوو لەناو گوماندا.
ئەو زێیەک بوو جامێک ئاوی سینە و دڵی
خۆی ئەدایتێ و ئەو تێری ئەخواردەوە: خۆخواردنەوە.
تەنیایی و مەراق خواردنەوە. بێهۆشیی خەڵک.. خواردنەوە.
تاریکیی مێژوو خواردنەوە.. تاڵاوی کوردبوون.. خواردنەوە.
گلدانەوەی شەو لە چاودا. هێشتنەوەی تڵپەی
میراتی هەزار ساڵەی خۆکوژی و دین و خورافات لە
بنی بنی هەناودا. قوم قوم شەوەزەنگ خواردنەوە.
ئەوە عەبدوڵڵا جەوهەر بوو.



عەبدوڵڵا جوهەر

سالانێ بوو. ئەو قەڵەمێکی زیتەڵەی بەر باخەڵی
گەرم و گوڕی "گەلاوێژ" بوو. نووسینی وەک
ئاوی ڕەوانی بەفراوان. دوور لە وشە و دەستەواژەی
لێڵ و لیخن. کە ئەینووسی ئەتوت دارسێوێکی
ئالان بۆتە نووسەر و ئەنووسێ. ئەتوت پونگەیەک
ئەنووسێ. کۆترێ لەو کەژە ئەنووسێ. نەتئەزانی
قەڵەمەکەی پەلکە گیایە یان دەنووکی بولبولێک و
بارەکەوێ. نەتئەزانی ئەوە کوڵوانەی دایکێتی
قسە ئەکات و ئەنووسێ. یاخود کەواوسەڵتەی باوکی.
یان کوچە و کۆڵان و چوخم و باخەکانی سلێمانی.
کە ئەینووسی وشەکان ئەبوون بە کونجی. کە ئەینووسی
بە زمانی کوڵەباڵ و بەفرماڵ و سندوقی بوراق ئەینووسی.

ئەو بە قەدەر پیرەمەگروون کورد بوو. هێندەی ڕۆحی
سپی "گاندی"یش مرۆڤ دۆست بوو. دڵی هێلکە کۆترێکی
ناو هێلانەی تەنیایی بوو. جەوهەر ئەو خۆڵەمێشە بوو
کە لەسەر پشکۆی گەشاوە هەڵنیشتبوو. لەلای ئێمەی



کوڕ و کاڵ و شاگردی ئەو. بەقەد شەقامی مەولەوی و هۆڵی کتێبخانەی گشتی و لاکێشەکەی مەلعەبەکە و سێوی بن عەرد و پێشۆک و پەندەکانی پیرەمێرد و یەکەم بەفری نوا باریو. خۆشەویست بوو.

وەک بەری دەستی و پەنجەیی و مووی قژی ماش و برنجی و سپێنەی چاوەکانی خۆی. مێژووی گەلەکەی ئەناسی. قەڵەمی جوانی ئەناسی. ئەو ئەیزانی جوانترین باخی پەخشان و بارانی شیعر و قەسیدە لەلای کێیە؟ ئەو وەختەی ئەچووە بەردەمی (نالی). ئەبوو بە کەوانەی سوجدە. وەختێ ئەگەیشتە سەر (بلە) و زمانەکەی چاوم لێبوو: ئەبوو بە گوڵ خەندەران و هەموو جەستەی پێئەکەنی. وەختێ ئەگەیشتە سەر لوتکەی شیعری "گۆران"، سەیری قۆپی قەرەداخ و شاخی زەردە و نیشتیمانی گوڵەزەردی ئەوێی ئەکرد، ئیتر جەوهەر لە خۆشیاندا، سەری ئەبوو بە گەواڵە هەور و دائەڕژا و تێکەڵ ئەبۆوە بە سیروان. ئەوەی کە باسی نەئەکرد. ئەوەی لێی دوور ئەکەوتەوە ناوی بێنێ. تەنها و تەنها هەر قەڵەم و بەهرەی خۆی بوو.

ئەوە چی بوو؟! لەو ڕۆحە خۆنەویستەدا؟! کە فڕینی خۆی دیل ئەکرد. ئەوە چی بوو؟ لەو گەرداوی پرسیارەدا کە چارۆگەی خۆی دائەگرت؟ ئەوە چی بوو؟! لە گومانی ئەو دڵەدا کە نەیئەویست دەنگی دەربێ و بێدەنگ ئەبوو؟! ئەوە چی بوو لەو کتێبە نەهێنیە و لەو قەڵەمە تەنیاییەدا. تێنەگەیشتم! ئێستا و ئەوسایش تێنەگەیشتم!

تەنیا ئەژیا.. وەک خەمی خوا و
ئەو درەختە تەنهایانەی
کە هەر خۆیان ماونەتەوە و
بەجێماون لەسەر گردێ
تەنها ئەژیا
وەکوو شیعرێکی نالی بێ و
بەجێمابێ لەم شارەدا
پەنجەرەیەک غەریب بە ماڵەکەی خۆی و
باڵندەیەک غەریب بە ئاسمانی خۆی و
ژێیەک غەریب بە ئاواز و نەغمەی خۆی و
غەریب.. غەریب
تەنیا ژیا و لە هێلانەی تەنیاییشدا بە تەنها مرد!



چەندین وەرزە.. تەمەنێکە.. عومرێ لە شەو
قەسیدەیەک بووە بە مۆم لە دڵمایە و داگیرساوە و
ناوی عەبدوڵڵا جەوهەرە. لە هەرکوێ بم من ئەو
مۆمەم لەگەڵدایە و لەسەر چیا ئەو وەختەی بەردمان
کردبوو بە کتێب و گەواڵە هەور بە کاغەز و قەڵەم بە گیا.
ئەو ڕۆحەم هەر لەگەڵدا بوو.. لە کەناری ئۆقیانووسدا
لەگەڵ خۆمدا ئەو پیاوەم برد بۆ ئەورووپا.. زەردەخەنەی
ئەو عەشقەم برد بۆ لای لۆرکا. هێمنیەکەی ئەو
حیکایەتە تەنیایەم لەگەڵ خۆمدا برد بۆ چیخۆف.
ئەویان کردی بە زەردەپەڕی شیعرێک و ئەمیان کردی
بە چیرۆکی شمشاڵێکی باریکەلە و لە سیبریا کۆیلەیەکی
سۆڤیەت بۆ خۆی لێیدا. لەگەڵ خۆمدا خۆشەویستیی
ئەو پیاوەم برد دامە دەستی هەتاوێکی پێست ڕەشی
خوارووی ئەفریقا و ئەویش کردی بە یەک مەدالییای
کەسکی ڕۆژی ئەوینی ئازادی و کردیە گەردەنی ماندیلا.



من ئەمشەو وشەی سەرخۆشی ئەم زەمانەم
سەرخۆش بە بادەی جەوهەرێ.
کە کردوومی بە "با" و بایەوانی
بەلەمێکی سەر هەڵگرتووی شێت و شەیدا.
سەما ئەکەم.. بە چواردەوری.. بازنەیی
ئەم یادەدا سەما ئەکەم جارێک وەکوو سەمەندەر و
جارێکی دی وەک کەمەری گەردەلوولی
شیعرێک لەسەر دوندی چیا.
سەما ئەکەم.. ڕانک و چۆغە خورماییەکەی لەبەرمایە و
کڵاشەکەی لە پێمایە و پشتێنەکەی - کە لە کراسی
دایکی بوو - لە قەدمایە و.. باریک باریک سەما ئەکەم.
ئاواتە جوانەمەرگەکەی لەگەڵمایە
خەزانی خۆڵەمێشیەکە و پاییزی وشەی زمانی
لەگەڵمایە.
سەعاتەکەی لەدەستمایە و سەیری زەمانی زوو ئەکەم.
من ئەمشەو پڕپڕم لە تەم.
لە مانگەشەوێ خۆڵاویی.
ئەستێرەی کوژراو ئەبارێ بەسەر سەرما و
جریوەی سوور تەڕیکردووم.

لەسەر گۆڕەکەی وەستاوم
سلێمانی فرمێسکێکە وا لە چاوما و
لە فرمێسکدا جەوهەر دیارە و

عبدوللا جوهر



دڵۆپ ئەڕژێ و جەوهەر ئەڕژێ و
منیش لەگەڵ هەردووکیاندا
قەسیدەیەکی ڕژاوم.

لەسەر گۆڕەکەی وەستاوم
جەوهەر ئێستا وەکوو نیشانەی سەرسوڕمان
لەبەردەممایە و ئەیبینم، لەناکاویش
ئەبێتەوە بە پرسیار و دێت و ئەچێ و
کە ئەمبینێ ڕائەوەستێ و
دەستێک ئەخاتە سەر شانم.

((ئەگەڕێمەوە سەر کورسی چایخانەکەی جاری جاران.
سێ چوار گەنجین سەرمان بردۆتە پێشەوە نزیک
دەمی، قسەی ئەکرد. قسەی تازە. قسەی
خەتەر. لە بازنەی ناوهێنانی دیکتاتۆردا کە
ئەوترا مۆسۆلینی یاخود هیتلەر. ئەو ڕستەکەی
تەواو ئەکرد: کەڵبەی ستالین لە کەڵبەی مۆسۆلینی و
کەڵبەی ماو سی تۆنگ لە کەڵبەی هیتلەر زۆر
تیژترن. بیرتان نەچێ. ئەم کۆمارانەی سۆڤیەت
هەر هەموویان کۆماری ترس و مردن و سێدارەن و
درۆی گەورەی ناو دیرۆکێکی خوێناوین..
ئەو ڕۆژگارە گەرووی ئەم دەنگانە کەم بوون
لە ڕۆژهەڵاتدا هەر نەبوون. ئەو ڕۆژگارە لە دەنگی
تەپڵی سوور زیاتر نەئەبیسترا!))

((ئەو نە زەریای چەنەباز و هەڵەوەر بوو
نە شەپۆلانی زۆر بڵێ و نە هاژەهاژی غورور و
نە وژەوژی هەڕەشەی دارستانە چاو سوورەکان.
نە ئەستێرەی خۆپەرست و. نە ڕووناکبیری فیزلێدەر.
چون باڵەخانەی لووت بڵند بەسەر کوچە و خانووە
نزمەکانی شاردا. بە بێدەنگیی ئەو وەکوو بەفر
ئەباری. بە بێدەنگیی وەکوو کانییەک هەڵئەقوڵا و
وەک پەلکەگیا سەری لە خاک دەرئەهێنا و چون
خەمی کورد تەنیا و تەنیا))

لەسەر گۆڕەکەی وەستاوم
وەفام وەک لقی شۆڕەبی دائەنەوێ
تەختی تەوێڵی ماچ ئەکا.
بە پەنجەی یاد لەسەر کێڵەکەی ژوور سەری
بە هەندێ گەڵای خەزان و بە چیلکەیەک



وەکوو ئێسکی ئەمێستاکەی
وشکەوەبوو.. بە چیلکەیەک
کە خۆڵاوێک لە چاڵێکدا
بۆتە شووشەی مەرەکەبی
"با"یەکی سەرگەردان دێت و
ئەم شیعرانە لە گیرفانی هەورێکی سەر سلێمانی
دەرئەهێنێ لەسەر کێلەکەی ئەنووسێ:

ئالێرەدا حیکایەتێ ڕاکشاوە
لە هێوریدا تریفە ئیرەیی زۆر پێئەبرد و
ئالێرەدا ئەو پەخشانە پاڵکەوتووە.
کە بۆ پاکیی بەفر کردی بە هاوڕێی دەستەڕاستی
زمانی کوردی پێی ئەوت
تۆ ئارمی سەر ناوچەوانمی.

ع. جەوهەر..
خۆی تەنیایە و خۆی یەک کەسە و
وەلێ ئێستا
چوار ماڵی هەیە و تیا ئەژی..
ماڵی سروەیەک لە کەلی "ئاوبەر"دا و
ماڵی خوێنی قوربانییەک لەسەر شەقامی "ئامەد" و
ماڵی چاوی گوڵەبەڕۆژەیەک
لە کێڵگەیەکی "عفرین"دا و
ماڵی چوارەم.. ماڵی چۆڵی قەڵەمێکی بێ ژن و ماڵ،
بێ منداڵ و بەبێ نەوە و غەریب لەناو
شاری خۆیدا
تاق و تەنیا..
وەک مەلێ لە پۆل دابڕاو
چون باڵەبانێ گۆشەگیر
تاق و تەنیا
وەک ئەم فرمێسکەی چاوی من
لەم شەوەدا
تاق و تەنیا
تاق و تەنیا
عەبدوڵڵا جەوهەر!.

شێرکۆ بێکەس
سلێمانی ٢٠١٣/١/١١








# عەبدوڵڵا جەوهەر و
# ڕۆژگارێکی ئەدەبی کوردی



**ئومێد ئاشنا**

چەند ساڵ لەمەوبەر «عەبدوڵڵا جەوهەر»ی ئەدیب و ڕەخنەگر، کۆچی دوایی کرد. لە کۆچکردن و یادکردنەوەشیدا، ئێمە بێ دەنگ بووین، کە دەبوا وەها نەبوایە، چونکە کاری ئەدەبی و تێکۆشانی بەردەوامی ئەم مرۆڤە، لە ڕادەیەکدایە کە هەموو ساڵ بابەتی نوێی لە بارەوە بنووسرێ و دواجاریش لە چاپ بدرێ. بۆ ئەوەی ئەم نووسینەی ئێمە بتوانێ پەنجەرەیەک لە ڕووی ئەم مەسەلەیەدا بکاتەوە، بەرهەمەکانی لە بڵاوکراوە و دەستنووس بەم جۆرەی خوارەوە دابەش دەکەین:

(١)پەخشانی هونەری

(٢)چیرۆک

(٣)شیعر

(٤)ڕەخنە و ڕەخنەی زمان

(٥)وەرگێڕان لە عەرەبی و ئینگلیزییەوە.

(٦)پەند و ئامۆژگاری.

ئەم نووسینانەشی بەم ناوانە بڵاوکردۆتەوە: (ع. چالاک)،

عەبدوڵڵا جەوهەر

(ع)، (ج١)، (ع.جەوهەر)، (ع ج)، بە تایبەتی لە گۆڤاری گەلاوێژ و ڕۆژنامەی (ژین)دا. ئەم نووسەرە کەمتر حەزی لە خۆدەرخستن و خۆبردنە پێشەوە و ناوبانگ هەبووە.
لە نووسین و لە کردەوەشدا وەک هەمووجار دەمانبینی، سادە و ساکار بوو، هەتا خەڵکیی باسیان نەکردایە، ئەو باسی خۆی و نووسینەکانی نەدەکرد. یەکەم بەرهەمی بڵاوکراوەی وەک من ئاگادار بم، ساڵی (١٩٣٩) لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بوو بەناوی (گلەیی)، کە لە زمانی ئینگلیزییەوە کردبوویە کوردی. بەڵام پێش ئەمە ساڵی (١٩٣٧) بە هۆی هاندان و دەستگیرۆیی پیرەمێردی نەمرەوە، کۆمەڵێ بەرهەمی خۆی کۆکردەوە و لە چاپخانەکەی پیرەمێرد دا بەناوی (ئاوات)*ەوە چاپکرا، بەڵام بەداخەوە کاربەدەستانی ئەو سەردەمە دەستیان بەسەرا گرت و نەیان هێشت بڵاو ببێتەوە. بەڕاستی پیرەمێرد وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی بۆ هەموو شاعیر و نووسەرێک باوکێکی دڵسۆز و مامۆستایەکی ڕابەر بوو، بەتایبەت لەو کاتەشدا بۆ لاوێکی حەڤدە ساڵی وەک عەبدوڵڵا جەوهەر.
لەلایەکی کەوە مایەی دڵخۆشییە کە نووسەرێکی لاو، سەرەتای بەرهەمی بڵاوکراوەی لەو سەردەمەدا پەیوەندیدار بێ بە زمان و ئەدەبێکی باڵای جیهانییەوە، کە زمان و ئەدەبی ئینگلیزییە، کەمێک وەستان لەسەر ئەم نۆبەرەیەی نووسەرێک پێویستە، لە مانگی مارتی ساڵی (١٩٣٩)دا لە ژین دا دەنووسێ: «ڕۆژێکی بەهار بەسەر فەرشی نوێی تەبیعەتدا بەناو گوڵاڵە و لالەزاردا سەر لەبەیانی ملی ڕێگام گرت بۆ دەشت، بۆ گەشت، ڕۆیشتم تا گەیشتمە سەر یاڵێک لەوێ هەڵۆیەکم دی، مەلێکی لەژێر چنگا بوو، خەریکی لەت و کوتکردنی بوو. زۆری پێ نەچوو، پۆلێک مەلی تر هاتن و لەوێ نیشتنەوە، بەڵام بەهیچ تەرحێک تەماشایەکی ئەو پەلەوەرە بێ نازەیان نەکرد. لەڕێ گوزاردا ئاغایەکم دی تێڵایەکی لە نۆکەرێکی ڕووت و قووتی هەڵ گرتبوو، خەریکی بێدارکردنی بوو، ئەوەندەی لێ دابوو، خوێن وەک فیچقە لە لەشیەوە بازرەقەی ئەبەست، هێشتا نەگەیشتبوومە بەرەوە، نۆکەرەکە لە پەلوپۆ کەوت و لەژێر پێی ئەو زۆردارەدا ڕاکشا، بە هەزاران ئەهاتن و ئەچوون کەسێکیان دڵیان بەو داماوە قورپەسەرە نەدەسووتا کە لەژێر دەستی ئەو بەدبەختە دەری بێنێ، ئایا بۆچی هەموو ڕۆح لەبەرێک هەریەک بە تەنگ هاوخوێنیەوە نایەت و لە ڕۆژی تەنگانەدا فریای ناکەوێ، خۆ خۆریان هەرگیز لەناو نابرێ، لە دوای ئەمە لە بارەگای یەزدان پاڕامەوە، یا مەرگ، یان بەجارێ
چاوپێنەکەوتنی چنگی خوێناوی زۆردار و نەبیستنی ناڵەی داماوان و گریەی هەژاران، بەڵام یەزدان دوعاکەمی هێنایە جێ و ئیتر منیش گوێم لە هەموو ترشی و تاڵیی و بێ پەیمانییەکی زەمان لینج بووە».
ئەم پارچە ئەدەبییەی کە نووسەر هەڵی بژاردووە، لە دوو لایەنەوە تەماشا دەکرێ، یەکەم لایەنی ئسلووب، واتە شێوەی نووسین و دەربڕین، کە ئەمیش لەو کاتەدا وەک زۆر لە شاعیر و نووسەرەکانی ساڵانی سی و سەرەتای چلەکان لەژێر کاریگەرییەکی ڕۆمانتیکییانەدا بووە.
نەک هەر ئەمە، بەڵکو ئەو پارچە پەخشان و وتار و چیرۆکانەش کە نووسیونی، لە ڕووی شێوەوە پەیڕەوی قوتابخانەی ڕۆمانتیکی کردووە.
لەلایەنی بابەتیشەوە، نووسەر لە هیچ بەرهەمێکیدا دوای خەیاڵ و ئەفسانە و بیروباوەڕی کۆن و پڕوپووچ نەکەوتووە، بەڵکو بابەتەکانی لە واقیع و ڕاستەقینەی ژیانی کۆمەڵەکەیەوە هەڵ هێنجاوە. نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانی خستۆتە ڕوو و هەوڵیداوە چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە و ڕوونتر بڵێین لەبارەی ناوەڕۆکیشەوە، نووسەرێکی ڕیالیزمی بووە.
بەڵام لەڕووی چارەسەرکردنەوە وەک لە نووسینەکانیدا دەردەکەوێ، وەک بیرکردنەوەی ئەو سەردەمە و کەمتر کامڵ بوون و پێگەیشتنی بیری شۆڕشگێڕی بیروڕای بە چارەسەر هەبووە. بڕوانە نووسینەکانی:

- نیشتمانپەروەر، ١٩٣٩.
- ئاغا گیان، ١٩٤٨.
- ناڵەی هەژارێک، ١٩٤٢.
- هاوار ژنینە، ١٩٤٣.
- من و یارم، ١٩٤٢.
- چوار هەژار، ١٩٤٥.
- لە خەوما، ١٩٤٤.

لەناو ئەمانەدا، لە هەموان زیاتر، ساڵی (١٩٤٨) لە گۆڤاری گەلاوێژدا، پەخشانی ئاغا گیان دەنووسێ، دیارە ڕاپەڕین و بارودۆخی ئەو سەردەمەی عێراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی، و پێگەیشتنی بیروباوەڕی شۆڕشگێڕیی، ڕاوەستان دژی داروەستەی زۆرداری پاشایەتی، کاری کردۆتە سەر قەڵەمی عەبدوڵڵا جەوهەر، لەم نووسینەدا بەرەو دەربڕینێکی ئاشکراتر و هەنگاونانێکی نوێ دەڕوا، بەڵام بە داخەوە نەیتوانیوە بگاتە ئەنجام و تەنها باری ژیانی تاڵ و گوزەرانی دەردەسەری جوتیارێکی دەربڕیوە و هێمایەکی ئەوتۆی تێدا نییە بەرامبەر زۆرداری ئاغا، هێز و بزوتنەوەیەک لە ئارادا بێ و مژدەی نزیکبوونەوەی مەرگی هەموو ئاغاکان بدا، ع. چالاک، دەنووسێ: «ئاغا گیان پێڵوی چاوم بە پێکەنین هەڵداوەتەوە، تۆ بە چ ئایینێ ئەمگرێنی؟! گۆشکراوی سەربەستیم، لەبەرچی بە گوێما پێ بەپێی هەموو کەسێ بم، ئینجا بە چ دەستوورێ دڵ



نەوازەی تۆ بکەم؟! لە قوڕتیلی هەموو ئاواتێکم زیاتر بۆچ ناهێڵی پەنجە لە پەنجەی ئینسانێک بدەم، ئینسان نیم؟! یا بە ئینسانم نازانی؟ بە ئومێدی چاو برینە بەختیاری بەرەو ڕۆشنایی ژیان ختوکە و دڵخۆشی دراومەتەوە، تۆ بە چ باوەڕێ پێوەنگی دیلیت، لە ئەستۆم گرێ داوە و سەراسیمە و حەپەساو بە گوێ دەریای مەینەتا ئەمگرێنی بۆچی من بچەوسێمەوە و ئاسوودەیی و خۆشبەختیش بەبالای تۆ برا بێ؟ بۆچ من وێڵ بم و تۆ ئازاد و سەرفراز» . بەلای منەوە، ئەگەر لە کاتی خۆیدا، واتە ساڵی ١٩٣٧، کتێبی (ئـاوات)ی ع. چـالاک بـلاو بـوایـەتـەوە، ئـەوا کاریگەرییەکی زۆری دەبوو لە دوو لایەنەوە، یەکەم، دەکەوتە دەستی خوێنەران بەگشتی و لە کتێبخانەکاندا هەموو کات جێگای خۆی دەگرت. دووەم، ئەو نووسەرانەی لەو کاتەوە سەبارەت بە پەخشانی هونەریی و چیرۆکی کوردی نووسیویانە، زیاتر ئاوڕیان لە بەرهەمەکانی ئەم ئەدیبە دەدایەوە و ئامادەیی وەک سەرچاوەیەک لەبەر دەستیاندا دەبوو، وە ئەگەریش جاروبار ئاوڕی لێ درابێتەوە، ئەوا دیارە ئەو نووسەرە گەلێ ماندوو بووە و لەم گۆڤار و لەو ڕۆژنامە هەتا بەرهەمێکی دۆزیوەتەوە، هەتا ئێستا کە باسی نووسینەکانی عەبدوڵڵا جەوهەر کرا بێ، ڕاستە و ڕاست باسی گۆڤاری گەلاوێژ کراوە، چونکە زۆربەی بەرهەمەکانی لەوێدا بلاوکردۆتەوە. لەپاش داخستنی ئەم گۆڤارە لەساڵی (١٩٤٩)دا، ئیتر ئەویش لە بلاوکردنەوەی وەستاوە و نووسینیشی کەمتر بووە و ئەو گەرم و گوڕییەی جارانی، بلێسەی کەم بووە. ئینجا سەرەتا کە باسی بەرهەمی ع. چالاک- مان کرد لە (ژین)دا، باسی ئەوەمان کرد کە چۆن (پیرەمێرد)ی نەمر یارمەتی داوە و زۆر جاریش لە ڕووی زمان و داڕشتنەوە، هەندێ دەستکاری لە نووسینەکانیدا کردووە و بۆی بلاوکردۆتەوە. لەو نووسینە سەرەتاییانەی، پەخشانێکە بەناوی (نیشتمانپەروەر)، کە ساڵی (١٩٣٩) بلاوی کردۆتەوە. ئەم پەخشانە گرنگییەکی تایبەتی هەیە و بۆ کەسێک لەو تەمەنەدا وەها بنووسێ، شایانی سەرنج و ئافەرینە، لەو نووسینەی «ع. چالاک»، دوو خاڵی زۆر گرنگ سەبارەت بە مەسەلەی ڕامیاری و نیشتمانپەروەری دەستنیشان کـردووە، یەکەمیان، ئایا نیشتمانپەروەری ڕاست کێیە؟ دووەم، ئایا کام ڕێگای تێکۆشان دەتوانێ گەل بگەیەنێتە ئامانجەکانی؟ لەم بارەیەوە دەنووسێ: «ئێمە کە ڕۆڵەی ئەم ناوەین، لامان وایە هەرچی ڕیشی سوورە هەمزاغایە، هەرچی هات و زمانی لووسی لێ خستینە کار ئەگەر دوژمنیشمان بێ، بێ تاقیکردنەوە ئەچینە سەر بیری و ئەبینە گورزی دەستی، نیشتمانپەروەر، ئەو دلاوەرییەیە بەماڵ و بەگیان تەقەلا بدا و درێغی نەکا لەڕێی دەرهێنانی

گەلیا لەژێر پەنجەی بێگانە، لەم قەڕنی بیستەمەدا بەقسەی خۆش و بەخەندە و پێکەنینەوە، ئیشمان ئەوە نییە دەستی نەزانکاران، هەروەها نالەی هەژارێک، چیرۆکێکی ساکارە، بەلام بۆ ڕۆژگاری خۆی تایبەتی هەبوو باسی هەرەوەزی و یارمەتیدان دەکا لە کۆمەڵدا، کە نموونەی ڕەوشتی بەرز و بیری مرۆڤانەیە. بەو جۆرەی کۆمەڵێک مەل کە گیانداریکیان لەناو باخێکدا تووشی کارەساتێک دەبێ و ناتوانێ ڕزگاری ببێ، بەلام هاوڕێکانی دەگەڕێنەوە سەری و بەجێی ناهێڵن، هەتا بە هەموو ڕزگاری دەکەن، بەلام ئەم مرۆڤێک دەبینێ کە ئافرەتێکی بێ دەرەتانە، دەسووڕێتەوە و کەس لای لێ ناکاتەوە و یارمەتی نادا، و بەراورد دەکا کە ئەو باڵندانە بەو جۆرە گیانی یارمەتیدان و لەخۆبردنیان تێدا بوو، بەلام ئێمەی مرۆڤ نەمانتوانی ئەو ئافرەتە ڕزگار بکەین و تەنانەت وەک ئەو باڵندانە ڕەفتار بکەین، لە پەخشانی (من دیارم)دا بەشێوەیەکی ڕۆمانتیکی لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا دێتە گفتوگۆ، بەلام وەک شێوازی باوی ئەو سەردەمە لە کۆتاییدا دەیباتەوە بۆ سەربەستیی ئافرەت و باری دواکەوتوویی کۆمەڵ. لەسەرەتادا دەنووسێ: «کێ ئەتوانێ بلێسەی ئاگری ئەم دووکەڵە بکوژێنێتەوە؟ کێ ئەتوانێ ئەم دووگوڵە لەیەک بکا و هەڵیان وەرێنێ؟ کێ ئەو بیری خۆی لە قەرەی پساندنی تەلی دوو دڵ نووساند و بەهێز وەک من و تۆ؟ کێ دڵی دێ ڕۆشنایی ئەم دوو چرایە لەناوا نەهێڵێ؟ کەس.. ئەگەر بە وردی تەماشای بەرهەمی ئـەم نـووسـەرە و زۆر لە نووسەرانی تریش بکەین کە لەو سەردەمەدا نووسیویانە، بە ئاشکرا ئەو هێڵە ڕۆمانتیکی و شێوازە باوە دیارە کە لەو ڕۆژگارەدا، لەناو نووسەراندا پەرەی سەندبوو و بە شێوەیەکی نوێ لە ئەدەبی کوردیدا دەناسرا. ئەمەش لە دوولایەنەوە بوو، لایەنی یەکەم کە زیاتر نزیک و کاریگەر بوو، ئەو شەپۆلە بوو کە لە ئەدیبەکانی (مەهجەر)ی عەرەبییەوە بە هۆی کۆمەڵی (الرابطه القلمیه)ەوە دەهات بۆ ڕۆژهەلات، کە زیاتر بریتی بوون لە نووسینەکانی: جبران خلیل جبران، میخائیل نعیمە، زۆریان وەردەگێڕدرانە سەر کوردی، لەوانە بەرهەمی ئەو نووسەرانەیان کردۆتە کوردی لەو سەردەمەدا زیاتر لەژێر کاریگەری ئەواندا بوون، ئەمانەن:

- پیرەمێرد لە پەخشانی مناجاه ارواح ی جبران خلیل جبراندا.
- گۆران، لە شیعری دوێنێی بالامس ی جبراندا.
- میرزا مارف لە وجمال الموت دا.
- عەبدولقادر قەزاز، لە گەلاوێژ و ژین دا.

ئەحمەد هەردی، شاکر فەتاح، عەلائەددین سەجادی و بلە و ڕەشید نەجیب و دڵشادی ڕەسووڵی و ئیبراهیمی نادری

له گەلاوێژ ودەنگی گێتیی تازەدا و چەند نووسەری تریش. لەناو ئەمانەشدا عەبدوڵڵا جەوهەر پەخشانی ژنی ئازادی لەژێر کاریگەریی ئەواندا وەرگێڕاوە.

ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە هەتا ساڵانی پەنجا، لەژێر ئەم کاریگەرییەدا مابوونەوە و شێوازی ڕۆمانتیکی و ناوەڕۆکی ڕیالیزمانەیان ڕەچاو دەکرد، بەڵام وردە وردە بە هۆی بەرزبوونەوەی هۆشی سیاسی و بزووتنەوەی نیشتمانییەوە ناوەڕۆک بەرەو ڕیالیزمی شۆڕشگێرانە ڕۆیشت و دیارە کە شێوازی دەربڕین و دارشتن وەک خۆی نەمایەوە، ئینجا لەڕووی شیعریشەوە، با ئاوڕ لە عەبدوڵڵا جەوهەر بدەینەوە و بزانین لەو چەند پارچە شیعرەدا چی بۆ کردووین. ع. چالاک، لای هەموان بەهەر شێوەیەک ناسرابێت وەک شاعیر نەناسراوە. لەڕاستیشدا هەر وایە و خۆشی ڕای وەها بووە، بەڵام لە سەرەتادا چەند پارچە شیعرێکی لە ساڵی ١٩٤٢دا لە ڕۆژنامەی ژین دا بڵاو کردۆتەوە، بەم ناونیشانانە: ( لە دوور وڵاتیکەوە، هاوزمان، کەڵەباب و باز). من چەند گەڕام لەم سێ شیعرە زیاترم نەدییەوە. لەوانەیە خۆیشی هەر زوو وازی لە شیعر هێنابێ و نەچوبێتەوە بەلایدا، ئەمەش لەبەر دوو هۆ، یەکەم: خۆی هەستی کردووە کە بەمانای تەواو ناتوانێ شاعیر بێ، دووەمیش هەستی کردووە کە وادەی دەربڕین و توانای لە نووسیندا زیاترە و لەو بوارەدا دەتوانێ زیاتر مەبەستەکانی خۆی بگەیێنێت.

لە کۆتاییدا دەڵێین (عەبدوڵڵا جەوهەر)ی نووسەر و ڕەخنەگر، لە سەردەمێکی دژوار و سەختدا، قەڵەم بەدەستێکی نەترس و خاوەن داهێنانێکی ئەدەبی و پەخشاننووسێکی دیاربوو. هەزار ڕێز و ئافەرینیش بۆ گۆڤاری گەلاوێژی هەمیشە گەش و نەمر، کە زۆر نووسەری وەک (عەبدوڵڵا جەوهەر)ی پێشکەش کردین و ماڵی ئەدەبی کوردیمانی ئاوەدان کرد.

**سەرچاوەکان:**


١. عەبدوڵڵا جەوهەر (ع. چالاک): لە ساڵی ١٩٢٠ لە دێی مێوڵی ناوچەی قەرەداغ لە دایک بووە و سەرەتای خوێندنی هەتا زانکۆی بەغدا لە سلێمانی بووە. لە ڕێکەوتی ١ی حوزەیرانی ١٩٨٢ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە، تا ئێستا تەنها کاک ئازاد عەبدولواحید وتارێکی لە ڕۆژنامەی العراق دا لەسەر نووسیوە.

٢. گلەیی، ژین، ژمارە ٥٥٨، ١٩٣٩.

٣. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤. پەخشانی ئاغا گیان، گەلاوێژ، ژمارە ٣، ساڵی نۆ، ١٩٤٨.

٥. ژین، ژمارە ٥٧٢، ١٩٣٩.

٦. گەلاوێژ، ژمارە ٩، ١٠، ١٩٤٢.

٧. گەلاوێژ، ژمارە ١١، ١٢، ١٩٤٢.

٨. هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٩. بروانە: جبران خلیل جبران، تالیف میخائیل نعیمە.

١٠. ژین، ژمارە ٦٧٦، ١٩٤٢.

١١.هەمان سەرچاوە.






# عەبدوڵڵا جەوهەر..
# دەریایەکی بەرین و مەنگ



**عەلی سام ئاغا**

لە ڕاستیدا ئەو ناوەی کە لێی نرابوو، پڕ بە پێستی خۆی بوو، ئەو جەوهەرەی کە لە دەریایەکی پانی بێ بنی هێمن و مەنگ ئەچوو، بریتی بوو لە کۆمەڵێک ڕەوشتی بەرز و وەفاداریی و لەسەرخۆیی، لە سەرچاوەی کانیاوی ڕوونی کوردایەتییە و ڕەنگ و ڕووی خۆماڵێتی و نەبەزین و شەرەف و کەرامەتی نەتەوەیی لێ ئەباری، لەو بڕوایەدا بوو کە بەهێز و توانای لەبن نەهاتووی جەماوەری کورد نەبێت، کورد لە باوەشی دەستبەسەریی ڕزگار نابێت، بۆیە هەموو متمانەیەکی و بۆچوونەکانی لەسەر ئەو قاڵبانە دائەڕشت کە سەرچاوەی هێز و تواناکەی بگەڕێتەوە بۆ نەتەوە بەش خوراوەکەی، ئەو نەتەوەیەی تا ئێستاش لە هەموو مافێکی ڕەوای مرۆڤایەتی بێ بەشە و تا ئێستاش لە کۆشکی دیلێتیدا ئەناڵێنێ، بۆیە کاکە جەوهەر هەموو کاتێک لەو بڕوایەدا بوو، ئەبێت کوردستان لە لیتەی بێگانە پاک بکرێتەوەو دڕک و داڵی لێ بژار بکرێت، لای وابوو تا تاکە بنکەیەکی بێگانە لانەی مابێت، هەرگیز دانیشتوانی کوردستان حەوانەوەیان نابێت و هەموو کات دەستی ستەم و تاوان هەڕەشەی کاولیی و وێرانەیی و دەربەدەری لە گەلە چەوساوەکەی ئەکا، بۆیە بەدەم بانگەوازی جوان مەرد و شۆڕەسوارانی ڕێبازی کوردایەتییەوە ئەچوو، ئەیویست کۆمەڵ کۆمەڵ قوتابیانی ئەو ڕێبازە نەمرە گۆش بکا بە بیروباوەڕی نەتەوەیی و بەرەو ڕوانگەی سەربەخۆیی و سەربەستی بجەنگن و لەبەر تیشکی زێڕینی ئەو بڕوا زیندووەدا خڵتەی بێگانە پەرستی لەناو وڵاتەکەیا پاکژ بکا و ڕەگ و ڕیشەی دووبەرەکێتی و براکوژیی لە ڕەگ و ڕیشە دەربێنێ. من وەکو هاوڕێیەکی وەفاداری ئەو نەمرە، ئەمە پانۆرامایەکی ئەوە کە ئەمەوێت بیگەیەنم، تا ناوە مەزنەکەی و هەڵوێستەکانی نەکەوێتە گێژاوی بیرچوونەوەی مێژوو، کاکە جەوهەر بە ئاینی کوردایەتییەوە چرایەکی ڕووناکیی بوو بۆ ڕۆشن کردنەوەی شەوەزەنگی ئەوانەی بەناوی کوردەوە گەلەکەیان بەرەو هەڵدێری هەزار بەهەزار ئەبرد، بۆیە لەو بڕوایەدا بوو سەربەخۆیی و ڕزگاری کورد، بەدەستی کورد نەبێت نایەتە دی و ئەیوت هەتا کۆڵەکەی دوارۆژی ئازادی و بەختیاری کورد لەسەر هەموو دڵۆپە خوێنێکی ڕژاوی کورد لە هەر جێیەکی وڵاتەکەدا ڕژابێت، ئەو دڵۆپە خوێنە وەک چوزەرەی ئومێد ئەو کۆڵە لە بن نەهاتووە پتەو ئەکات، لە دڵی هەموو جوان مەردان دا ئومێد و هیوای سەربەخۆیی پەیدا ئەکات و ئەبێتە هۆی خەباتی بێوچانی جەماوەری ڕەش و ڕووت، هەر ئەو هیوایە ترس و لەرزی سەرەمەرگ ئەخاتە دڵی داگیرکەرانەوە، ئەبێتە هۆی ئاگر تێبەردانی هەموو دامودەزگایەکی دوژمن، چونکە شۆڕش و

قوربانیدان لەپێناو وڵاتێکی زەوت کراودا، ئەوپەڕی شەرەف و کەرامەتی نەتەوەیی دەرئەخات، گەلێکیش کە زرەی کۆت و زنجیر بەگوێی ڕۆڵەکانی ئاشنا بوو بێت و لە تاریکی زیندانە تاریک و نووتەکەکانەوە دەنگ و نرکەی بەرگە گرتن گوێی گەردونی کەڕ کردبێ، ئەو گەلە بێگومان ئەگاتە ئامانج، بۆیە ئەو ڕۆژەی لاخۆش بوو کە لوولەی چەک ئاڕاستەی سنگی داگیرکەران بکرێ لە پێناوی ماف سەندنەوە و یەک خستنەوەی وڵاتە



دابەشکراوەکەیا، بۆیە وەک هاوبیرێکی ئەو کوردە نەمرە، وام بەباش زانی ئا لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا وەک بەڵگە نەویستێک بیخەمە بەرچاوی دانیشتوانی کوردستان، بۆ ئەوەی هەموو ساڵێک وەک پێویستییەکی سەرشان یادی بکرێتەوە.

١- زمانی شۆڕش بەرپاکردن کاتێک ئەکرێتەوە و جەنگی تۆڵە و بەرگەگرتن لە هەموو کون و قوژبنێکی وڵاتەوە دەبیسترێ، تا دوژمن مافی بەش خوراوی کوردی ژێر دەستەی پێشێل بکاو نیشتمانەکەی بە بەشێک لە وڵاتەکەی خۆی دابنێ.

٢- بانگەوازی سەربەخۆیی و سەربەستی و مافی مرۆڤ لە لوتکەی یەکسانی و برایەتی ڕاستەقینەوە لێ ئەدرێ، گوڵ و گوڵزاری هەڵپرووکاو ئەبوژێتەوە، ئەو ساکە ئاشتی نێو گەلان خۆی ئەنوێنێ، برایەتی و مرۆڤ دۆستێتی تا دێت پتە و ئەبێت کاتێک کەس بەشی کەسانێکی تر لووش نەدا.

٣- ئەبێت شێرەبەفرینەکانی داگیرکەر لە هەموو کون و قوژبنێکی وڵاتەکەماندا بچێتەوە تا لەجێی ئەوان لانەی کاول و وێران ئاوەدان بێتەوە و لە ڕوانگەی ئازادیخوازانەوە مافی ڕەوای کورد بنووسرێتەوە.

٤- چەند خۆشە سروودی ڕزگاری لە لووتکەی چیا بەرزەکانی کوردستانەوە لێ بدرێ و بیسەلمێنێ کە کورد کەرامەتی لەدەستچووی چۆن ئەسێنێتەوە، لەو کاتەوە کە دوژمن دەرگای زیندانەکانی خستۆتە سەرپشت بۆ ڕۆڵە قارەمانەکانی کورد، دەنگی بەرگەگرتن و کۆڵنەدان و تۆڵەسەندن بەرامبەر ستەمی تاوانبارانەوە تادێت لە گوێی دوژمنی داگیرکەران ئەزرنگێتەوە و بانگەوازی جەنگاوەران لە چیا بەرزەکانەوە لێ ئەدرێتەوە و بەروبوومی بەشخوراوان بەخۆیان ئەدرێتەوە، لەسەر لوولەی هێزەوە دادپەروەری و یەکسانی ئەنووسرێتەوە، مافی ڕەوای کورد بە زۆر لە دوژمن ئەسەنرێتەوە.

بۆ ئەو جەوهەرەی کە ئێستا لە باوەشی گڵدا پاڵ کەوتووە، تا ئەو کاتەی کە دڵە گەورەکەی لە لێدان کەوت، نەخۆشییە کوشندەکەی شێرپەنجەش بەو هەموو ژان و ئەشکەنجەیەوە نەیتوانی مامۆستای بەڕێز کاکە جەوهەر لە هێمنیی و لەسەرخۆیی بخات، لەو چاوە گەشانەیەوە ئەیڕوانی بۆم، لەوکاتەدا کە لێوەکانی وزەی وتنیان لێ بڕابوو، بەڵام بەچاوی تێی ئەگەیاندم کە خواست و ئاواتەکانی ڕۆژێک لە ڕۆژان بگەیەنم بەگوێی ڕۆڵە کۆڵنەدەرەکانی نەتەوەییەکاندا، بۆیە منیش ئا لەم سمینارە بچووکەدا بەکورتی هەست و بیر و باوەڕی نەمرێتی ئەوم گەیاند، تا ناوەکەی بچێتە ناو تۆمارگەی مێژووی کەڵە دلێرەکانی کورد و کوردستان.



کۆچی دوایی
مامۆستا عبدالله جەوهەر

ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی (١)ی حوزەیرانی ١٩٨٢ دڵی مامۆستای نووسەر عەبدوڵلا جەوهەر لەلێدان کەوت.. مامۆستای ناوبراو یەکێک بوو لە نووسەرەکانی گۆڤاری گەلاوێژ.. ناوبەناو بەناوی (ع. چالاك)و ناوی دیکەوە نووسینی بلاو دەکردەوە.. مامۆستا لە یەکی تەمووزی ١٩٢٠دا لەدایك بوو..

پرسەمان بۆ کەس و کاری خوا لێ خۆش بوو. هیواداریین لە ئایندەدا ئەو نووسینە بەنرخانەی بەجێی هێشتوون چاپ بکرێن و نامەخانەی کوردی پێ دەوڵەمەند بکرێن. بەوەش وەفاداریمان بۆ نووسەری کۆچ کردومان پیشان بدەین.

● دەستەی نووسەرانی هاوکاری ●

هەواڵی کۆچی دوایی عەبدوڵڵا جەوهەر لە ڕۆژنامەی هاوکاری



# عەبدوڵڵا جەوهەر زێوەرێک لەنێو ئاوێکی ڕووندا



یوسف محەمەد بەرزنجی

ئەو پیاوێکی بە ویقار و مەزن بوو، لە مەزنیی و پاکیی و لەنێو ڕێزێکی مەزندا بەدیار دەکەوت. ئەو گوڵێکی بۆنخۆش و نێرگزێک بوو، هەرگیز بۆنی ون نەدەبوو، پەپوولەیەکی باڵ ڕەنگینی ڕەنگاوڕەنگی قەشەنگ بوو، بەیانیان زوو لەگەڵ شەبەق و کازیوەی بەرەبەیاندا، کە خەڵکی شار وەڕێ دەکەوتن و لە جموجۆڵ و چالاکییەکی بەردەوامدا بوون بەرەو کارەکانیان دەچوون، ئەمیش لەگەڵ ئەواندا، شاڵە خورماییەکەی دەپۆشی و پشتێنە ئەنگۆرەکەی لەسەر دادەنا و جامانە قوتەکەی لەسەر تەوێڵی گەنم ڕەنگی بە شێوەیەکی بەرز و ڕێک دەپێچایەوە و لە گەڕەکی عەقارییەوە بە ئەسپایی و لەسەرخۆ هەنگاوە

عەبدوڵڵا جوهەر



لەسەرخۆکانی بەرەو پارکی گشتی دەنا، زوو زوو ئاوڕی بۆ دار سنەوبەر و گوڵەکانی ناو باخەکە دەدایەوە و خۆی لەبەردەم پەیکەری شاعیرێکی گەورەی شاردا "حاجی تۆفیق" ی پیرەمێرد دەبینییەوە، سەرێکی شانازیی بۆ لای ئەم پیاوە مەزنە بەرز دەکردەوە و بە زەردەخەنەوە بۆ پەیکەرەکەی دەڕوانی و ئەو (ئاوات) ەی بیر دەکەوتەوە کە ئەم پیاوە مەزنە لە ناخی ئەمدا چاندبووی، بە هەناسە هەڵکێشانێکی قووڵەوە هەموو یادەوەری و بیرەوەرییەکانی لەبەردەم ڕۆحی زیندووی پەیکەرەکەدا بەیاد دەهاتەوە و ڕۆحی خەفەکراوی لەنێو قوڵپی شەپۆلێکی خەمدا تێکەڵی ئاواتەکانی دەبوو، فرمێسکە قەتیس ماوەکەی بەئاگای دەهێنایەوە، خێرا دەستەسڕە سرکەییەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەردەهێنا و ئەشکی ڕابردووی پێ دەسڕی. وردە وردە هەنگاوی بەرەو شەقامی مەولەوی و لای کتێبخانەی زێوەر و گەلاوێژ دەنا، لە نێو شووشەی ڕوونی جامخانەی کتێبخانەکاندا لە کتێبەکان ورد دەبووەوە و بۆی دەڕوانین. زۆر جار لەگەڵ سڵاوی دۆستەکانیدا بەئاگا دەهاتەوە، پاشان هەنگاوەکانی بەرە و لای کتێبی ڕەنگاوڕەنگ و کاڵبووەوەی بەر تیشکی هەتاوی گەرمی هاوینان و ژێر دارە باڵابەرزەکانی شەقامی مەولەوی دەنا، لە کتێبی ڕیزکراو و هەڵواسراوی سەر دیواری تەنیشت بەریدەکە و سەر شۆستەکە و لە بەردەم کتێبەکاندا دەوەستا و لە کتێبە ڕەنگاوڕەنگەکانی دەڕوانی. پاشان دەفتەرەکەی بن هەنگڵی لەنێو زەرفەکە دەردەهێنا و لەگەڵ کتێبە نووسراوەکانی نێو دەفتەرەکەی خۆیدا بەراوردی دەکردن، تا بزانێ کام لەم چاپکراوانەی نییە. ئەوی نەیبوو، بەبێ پێچ و پەنا و بێمامەڵە دەیکڕین و بە پاندانە شیڤەرەکەی کە ڕەنگی ڕەش بوو، تۆماری دەکردن بۆ ئەوەی لە یادی نەچنەوە. ئەم ڕاوەستان و سەیرکردنە بەدیار کتێبەکانەوە سات و دەقیقە و کاتێکی زۆری دەبرد و ئەم پیاوە لەنێو خۆشەویستیی کتێبە جۆربەجۆر و ڕەنگاوڕەنگەکاندا ون دەبوو. ئەم، نەیدەزانی لەکەیەوە هاتووە و لە کەیەوە وەستاوە و بۆ کتێبەکان دەڕوانێ، مەگەر دەنگەدەنگی شەقامەکە و ڕێبوارەکان ئەمی بەئاگا بهێنایەتەوە، زوو زووش ئەوەندە ئارەق بەسەر ڕووخسارە گەنم ڕەنگییەکەیدا پەرش دەبووەوە، بیری دەچووەوە دەستەسڕە سرکەییەکەی دەر بهێنێ تا بیسڕێ و وشکی بکاتەوە. بۆیە زۆر جار پاش ونبوون بەدیار کتێبەکانەوە، سرکەییەکەی دەردەهێنا و سیمای پاکی پاک دەکردەوە. ئەم کردەوەیە لەسەر ئەم شەقامە و بەدیار کتێبەکانەوە، ڕۆژانی ساڵ بە بەردەوامی لە خولیاکانی ئەم پیاوەدا چەکەرەی کردبوو و خولقابوو. پاش شەن و کەوی کتێبەکان بە ماوەیەک، بەرە و گازینۆی گەل هەنگاوە لەسەرخۆکانی دەنا و لای وەجاخەکەوە بە ئەسپایی و هێمنی دادەنیشت و داوای چایەک و تۆزێ ئاوی دەکرد، زوو زووش دۆست و هاوڕێکانی سڵاویان لێ دەکرد و ئەمیش بە تێکەڵەیەک لە خۆشەویستی وەڵامی دەدانەوە. دواتریش هەندێ لە هاوڕێکانی کۆن و تازەی لای دادەنیشتن و دەستیان بە گفتوگۆ و پەیجۆری ئەدەب و ڕۆژگار دەکرد. ئەم پیاوە گەنم ڕەنگ و لاواز و لەسەرخۆ و گەورە و پاک و جوان ڕووخسارەی سەردەمی گەلاوێژ ، ناوی عەبدوڵڵا جەوهەر بوو.

ئەو کاتەی مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەرم ناسی، تەمەنم تازە لە پەنجەکانی هەردوو دەست تێپەڕیبوو، لە شەقامی مەولەوی لەگەڵ خوالێخۆشبوو "مەحموود خاکی"دا لە تەنیشت بەریدەکە و کۆتایی شەقامی مەولەوی و نزیک بە سەرای سلێمانی، سەرقاڵی کتێب فرۆشتن بووم. مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر زوو سەر لە بەیانیان سەردانی دەکردین و کتێبی نوێ و کۆنی لێدەکڕین و لەگەڵمان لەسەر شۆستەی شەقامەکە دەوەستا و سەیری کتێبەکانی دەکرد و ڕۆژانە گفتوگۆی لەگەڵماندا دەکرد و ئامۆژگاری بەسوودی دەکردین، کە تا ئێستاش

وێنە و ڕۆحی ئەم پیاوە زیندوو و پاک و بێگەرد و ڕووخسار مەزنە، لە یادەوەریما ماوەتەوە.
من ئەو سەردەمەی ئەوم تێدا ناسی و تێیدا بووم، بۆنی شیری خاوم لێ دەهات، تەنانەت ڕاست و چەپی خۆم لەیەکدی جیا نەدەکردەوە. لاوێکی کاڵفام و خوێنگەرم و تێکەڵاو بووم بە دنیای کتێب و ڕووناکبیری و بێئەندازە کتێبم خۆش دەویست. مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر ئەو کاتانەی سەردانی دەکردین، دەفتەرێکی لەنێو نایلۆنێکدا پێ بوو، هەر کاتێک کتێبێکی بکڕیایە لەنێو ئەو دەفتەرەدا تۆماری دەکردن، بۆ ئەوەی لەیادی نەچێ. ئەو دەفتەرەی مامۆستا لەو تەمەنەدا، زۆر سەرنجی منی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، بۆیە لە مامۆستام پرسی کە مەبەستی لە تۆمارکردنی ناوی ئەو چاپکراوانە لەو دەفتەرەدا چییە؟ ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دەدامەوە و دەیگوت: کوڕم من لە ساڵی ١٩٦٥وە تائێستا دوو جار کتێبخانەکەم بەخشیوە، جارێکیان بە مۆزەخانەی سلێمانی و جارێکی تریان بە کتێبخانەی گشتیی. لە ئێستادا بەبێ کتێب ژیانم بەدەر نابا، جا بەڵکوو تۆ وەک کوڕ و باوکێک و برایەک هاوکاریم بکەی و هەر کتێب و چاپکراوێکی کۆن و تازەت بۆ هات، بەڵکە ئاگادارم بکەیتەوە و هاوکاریم بکەی. بۆیە لەم دەفتەرەشدا تۆماری دەکەم تا لەیادم نەچنەوە، کە لە کتێبخانەکەمدا چیم هەیە و چیم نییە، تەنانەت وتیشی خەمی نرخت نەبێ، ئەگەر کتێبێک بە ٢٥٠ فلس بێ تۆ بە منی بدەی بە ٥٠٠ فلس من ڕازیم.
ئەم مامۆستا گەورەیە، ئەوەندەی کتێب خۆش دەویست، جگە لە کتێب هیچی تری لەم ژیانە خۆش نەدەویست. منیش بەڵێنم پێ دا کە بە چاوان هاوکارت دەبم و خەمت نەبێ. ئەوەبوو بەڵێنەکەم لەبەر خۆشەویستی بەسەخاوەتەوە جێبەجێ کرد و هەر کتێب و کتێبخانەیەکمان لە خەڵک بکڕیبایەتەوە، زوو مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەرم لێ ئاگادار دەکردەوە و ئەویش ئەوەی نەیبوایە دەیکڕی. تەنانەت مامۆستا ئەوەندە جێگەی متمانە و بڕوا بوو، ئەو کتێبانەی پاش هەڵایسانی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران لەلایەن سەیدیانی مەهابادەوە چاپ دەکرانەوە و بە قاچاخ و نهێنی دەمانهێنان بۆ سلێمانی و کتێبەکانی یەکێتیی نووسەرانی کوردستانی شاخ و بڵاوکراوەکانی شۆڕش کە خۆم یەکێک بووم لەو کەسانەی بڵاومان دەکردنەوە، زۆربەیانم دەگەیاندە دەستی مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر و ئەو زوو زوویش لە مەترسیی بوونی سەر ژیانم ئاگاداری دەکردمەوە و ئامۆژگاری بەسوودی دەکردم. بۆیە بە شانازییەوە دەڵێم ئەو کتێبانەی بۆ کتێبخانەکەی مامۆستا عەبدوڵڵام پەیدا کرد. ئەگەر هەموویم پەیدا نەکردبێ و زیادەڕۆیی تێدا نەبێ، سێ بەشی کتێبەکانی تا وەفاتی، من بۆم پەیدا کرد! ئەوکاتانەی مامۆستا باری تەندروستی چەند جارێک تێک چوو، من سەردانیم کرد و هەر کە دەگەیشتمە ژوورەوە هەواڵ و دەنگوباسی کتێبی لێ دەپرسیم و پێی دەگوتم لەیادت نەچێ هەرچیت دەست کەوت بۆم دانێ، کە چاک بوومەوە دێم دەیانبەم، تەنانەت ئەم پیاوە مەزنە، لەناوجێگە و سەرەمەرگیشدا هەر لە ئاوات و خەمی نیشتمان و خۆشەویستیدا بوو بۆ کتێب و چاپکراوەکان. مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر، جگە لەوەی ئەدیب و نووسەرێکی گەورە و قەڵەمێکی بە بڕشت بوو، پیاوێکی نیشتمانپەروەریش بوو، زۆر جار هەواڵی شاخ و هەندێ مەسەلەی لێ دەپرسیم و خەمێکی گەورەی هەبوو، ئەویش ئایندە و پاشەڕۆژی ئەم نیشتمانە و گەلەکەی بوو، ئەو لە بەرەی نیشتمان و گەلا بوو. نووسەری ڕاستگۆ دەبێ هەر ئەوەی لێ چاوەڕێ بکرێ، مامۆستا عەبدوڵڵا، زۆر جار هەواڵی کتێبەکەی بە ناوی ئاوات لێ دەپرسیم، کە ئەم نامیلکە و کتێبەی لە سەردەمی لاویدا ساڵی ١٩٣٨ لەلایەن حاجی تۆفیقی پیرەمێردەوە بۆی چاپ و بڵاوکرابووەوە و وەک ئاواتی لاوێکی ئەو سەردەمە بۆ پاڵپشتیی چاپ کرابوو. من ئەو

کتێبەم لابوو، بەڵام لەبەر خۆشەویستیم بۆ ئەو پیاوە نەمدەتوانی نهێنی بوونەکەی ئاشکرا بکەم، چونکە ئەگەر ئاشکرام بکردایە کە ئەو کتێبەم هەیە و لامە، نەمدەتوانی ئەگەر داوام لێ بکا پێی نەبەخشم، چونکە ئەو کەسێکی خۆشەویست بوو، بۆیە ئەوە بۆ ٣٠ ساڵ زیاتر دەچێ ئەو کتێبەم پاراستووە و وەک ئاواتێکی هەمیشەیی بۆن و یادگارییەکانی مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەری لێ دێ و تائێستا بە زیندوویی لام ماوەتەوە.

ئەوکاتەی لاو بووین، زۆر مامۆستای گەورەی ناو وشە و خەمی نیشتمان و قەڵەمم ناسی وەک مامۆستایان شاکر فەتاح، محەمەد مستەفا کوردی، هەردی، ئەخۆڵ، کاردۆخی، د. مارف خەزنەدار، محەمەدی مەلا کەریم، د. کەمال مەزهەر، شێرکۆ بێکەس ... تا لەم پیاوە گەورانەوە زۆر شت لە مەسەلەی نیشتمان و وشە و قەڵەمەوە فێر بووین و قەرزارباریانین.. دەمەوێ ئەوەش بڵێم: کەشکۆڵێکم هەبوو زۆر بابەت و ژیاننامەی نووسەرانم بە دەست و پەنجەی نووسەرانی وەک شاکر فەتاح و بورهان قانع ... تا، تێدا تۆمار کردووە و وەک بەڵگەیەکی زیندوو لام پارێزراوە. ئەو چەند جارەی سەردانی مامۆستام کرد و داوام لێ کرد و ویستم شتێکم بۆ بنووسێ لەبارەی خۆیەوە و پەیمانیشی پێ دام، بەڵام بەداخەوە زوو مەرگ بردییەوە و بەجێی هێشتین و ئاواتی منیش بۆ نووسینەوەی سەرگوزشتەی ژیانی مامۆستا بە با چوو، ئەگەر ئەو کارەم زوو بکردایە و فەرامۆشم نەکردایە، ڕەنگە ئێستا ببوایەتە بەڵگەیەکی زیندوو و باش بۆ نووسین لەبارەی ئەم پیاوە مەزنەوە. چەند لەبارەی ئەم پیاوە مەزنەوە بدوێین، هێشتا کەمە و لە وێزەی نایەین، بۆیە دەڵێم ئەو بارانێکی بەخوڕی پەڵە بوو، بەسەر هەموو زەوییەکدا باریوە و دڵۆپەکانی کۆتایی نایێ و ڕۆحی شاد و زیندوو بێ و یادی بەخێر بێ.



**شوێن و جێگەی کڕینی کتێبەکانی عەبدوڵڵا جەوهەر لای بەریدەکە- کۆتایی شەقامی مەولەوی، ئەم وێنەیە پاش سێ ساڵ لە کۆچی عەبدوڵڵا جەوهەر ساڵی ١٩٨٥ گیراوە، یوسف محەمەد.**



# فیلمی دۆکیۆمێنتەری جەوهەر



لەگەڵ ڕۆڤاری ئەم ژمارەیەدا کە تایبەتە بە عەبدوڵڵا جەوهەر، بە هێڵێکی جیاواز، هەردوو هونەرمەند خەسرەو حەمەکەریم و محەمەد قادر فیلمێکی دۆکیۆمێنتەرییان درووستکردووە بەناوی (جەوهەر) ئەو فیلمە دۆکیۆمێنتەرییەش ژیان و بەرهەم و وێستگە گرنگەکانی ئەو نووسەرە نیشتیمانپەروەرە لەڕێگەی هاوڕێ و خزم و نووسەرانی کوردەوە دەگێڕێتەوە..

لەبەشێکی فیلمە دۆکیۆمێنتەرییەکەدا چیرۆکی ئامادەکاری ڕۆڤار بۆ ئەو ژمارەیەی عەبدوڵڵا جەوهەر بە زمانی وێنە دەگێڕێتەوە، لەسەر زمانی ستافی ئەو بڵاوکراوەیەی سەردەمەوە چەند لایەنێکی شاراوەی ئەو نووسەرە و چۆنییەتی درووستبوونی بیرۆکەی ئەو ڕۆڤارە بۆ بینەران دەخرێتەڕوو.

فیلمی دۆکیۆمێنتەری جەوهەر ماوەی ٤٨ خولەکە و لە ئایندەیەکی نزیکدا نمایش دەکرێت.









عەبدوللا جەوهەر



جەمال شارباژێڕی

### وێنە و یادەوەری

# عەبدوللا جەوهەر..

## گەوهەری وشە و کوردایەتی




ئەو وێنەیەی عەبدوڵلا جەوهەر
پێشکەشی جەمال شارباژێڕی کردووە

ڕۆشنبیرێکی هەست ناسک و کوردپەروەر، لەسەرخۆ دەدوا و لە گفتوگۆکانیدا هەرگیز وشەی بێگانەی بەکار نەدەهێنا، بە کوردییەکی پەتی پوخت، کە دەدوا لە گوێگرتن لێی تێر نەدەبوویت. لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا بەهۆی مامۆستای هەرگیز لە یاد نەچووم فەرەیدون عەلی ئەمینەوە ناسیم، کە ناوبراو لە خوێندنگەی سەرەتایی چوارتا لە پۆلی پێنج و شەشمدا خوێندکارێکی لە ناخی هەستەوە گوێگری بووم، کە کوردی و مێژووی بۆ ئامادە دەکردین، هەستی کوردایەتی لە ناخماندا دەچاند، یەکێک لەو خوێندکارانەش کە پێکەوە بووین بەڕێز فەتاح ئاغا بوو کە لە دواڕۆژدا ئەو خەباتگێڕەی لێدەرچوو، لە پێناوی کوردایەتیدا خۆی بە شەهید کردن گەیاند، هـەزار درود بۆ گیانی فەتاح ئاغا و مامۆستا فەرەیدونی نەمر و عەبدوڵڵا جەوهەر، کە دەسپێکی سەرەتای ئەم لێدوانەم بوو لە سلێمانی نزیک سەرا، سەرەتای شەقامی مەولەوی کتێبخانەیەک هەبوو بەناوی " گەلاوێژ " ـەوە ئەگەر نەڵێم پایتەخت، سەنتەری ڕووناکبیرانی سلێمانی بوو بە نووسەران و شاعیران و هونەرمەندانەوە.. بەردەرگاکەی لەو هەڤاڵانە جمەی دەهات، هەر لەبەردەمی ئەو کتێبخانەیەدا مامۆستا فەرەیدون بەڕێز عەبدوڵڵا جەوهەری پێناساندم، هەروەک چۆن لە هەمان شوێندا مامۆستای نەمر " هەردی " شاعیری گەورەی پێناساندم، هەروەها بەڕێز دکتۆر ئیحسانی نەمر پێش ئـەوەی بچێتە دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن و بەدەستهێنانی دکتۆراکەی، بێجگە لە زۆر ناوی تر کە بەرە بەرە ناسیمن بە تایبەتی کە چوومە ناو جیهانی نووسینەوە.. یەکێک لەو ڕووناکبیرە دەگمەنانە کە بەهۆی هاوڕێی زۆر خۆشەویستمەوە کاک شێرکۆ بێکەسەوە ناسیم کاک حەمە عەلی عەزیز کۆپاندروو بوو، لە پاشدا چوو بۆ دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن و بەدەستهێنانی بڕوانامەی باڵند، لەو دوورە

وڵاتەشدا نازناوەکەی خۆی هەڵگرتبوو " کۆپاندروو " کە نیشانەی ڕەسەنایەتی و لەخۆ نەگۆڕانە..

مامۆستای شاعیر (ع. ح. ب) کە هاوسەرەکەی خوشکی بەڕێز عەبدوڵڵا جەوهەر بوو، هەر لەو سەنتەرەدا ناسیم کە بووە هاوڕێیەکی هەمیشەیی تا ئەو ڕۆژەی بەداخەوە مەرگ لە یەکتری کردین.. من و شێرکۆ برادەرێکمان هەبوو کە لە قۆناغی خوێندنگەی پیشەسازیدا تێکەڵمان بوو، ئەویش برای نەمر (لەتیف عەلی) بوو کە لە پاشدا بووە پێشمەرگە و بە نەخۆشی گەڕایەوە و بۆ چارەسەر گەیشتە ئەڵمانیا بەیارمەتی مامۆستای بەڕێزمان دکتۆری پرۆفیسۆر (جەمال نەبەز) ـەوە، کە هاوبیرمانە، لە نەخۆشخانەیەکی پێشکەوتووی ئەڵمانیادا چارەسەری بۆ دەکرێت، بەڵام دوای چوار ساڵ بەداخەوە جوانەمەرگ بوو، شیعرێکم لە یەکێک لە بەرهەمەکانمدا بۆ ئەو نووسیوە و بڵاوم کردۆتەوە.. هەروەها هاوڕێی بەڕێزم شێرکۆ بێکەس " کەژاوەی گریان " ـەکەی پێشکەش بەو کردووە..

هەر بەهۆی ئێمەوە عەبدوڵڵا جەوهەر برادەرایەتی لەگەڵدا پەیدا کرد، دەمدین زۆر جار پێکەوە پیاسە و دەمە تەقێیان دەکرد.. بیرمە شەوێکمان بە سێقۆڵی (من و شێرکۆ و لەتیف) لەماڵی کاکە عەبدوڵڵا جەوهەر بەسەر برد، ئەوکاتە لە گەڕەکی " عەقاری " لە خانوویەکدا دەژیا، کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو، شەرەفی ئەوەم پێبڕا کە بەرهەمەکانی منیش لە باوەش بگرێت، لە پاشدا ئەو کتێبخانەیەی پێشکەش بە نامەخانەی سلێمانی کرد.

هەر لەو شەوەدا کۆمەڵێک یادگاریی و بەسەرهاتی خۆشمان بەسەر برد، ئەمە جگە لەوەی زیاتر لە نزیکەوە ئاشنابووم بە دید و بۆچوون و تێڕوانینەکانی مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر، بۆ نەتەوە و نیشتمان و شیعر و ڕۆشنبیریی و چەند لایەنێکی تر، ئەوە بووە سەرەتایەکی باش بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بەم ڕۆشنبیرە گەورە و دیارەی نەتەوەکەمان ئاشنابم، کە بە بڕوای من دەبوایە زۆر لەپێشتر لا لەبەرهەم و نووسین و خامە دەوڵەمەند و پڕ لە بەرهەمەکانی بکرایەتەوە، بەڵام بەداخەوە ئەوە نەکرا.

ئەم یەکتر ناسین و پەیوەندییە درێژەی کێشا تا ساڵی ١٩٦١، وێنەیەکی خۆی بە دیاری پێشکەش کردم لە پشتەکەی چەند وشەیەکی کوردانەی تێدا نووسیبوو، پێم خۆشە لەم یادگارنامەیەدا پێشکەشی خوێنەری بەڕێزمانی بکەم، کە تا ئێستاش بەخۆشحاڵییەوە دوای ٥٣ ساڵ ئەو وێنەیەم وەک خۆی پاراستووە و لە ڕۆڤاردا بۆ یەکەمینجار وەک خۆی وێنەکە و ئەو چەند دێڕەی مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر بڵاودەکەمەوە..



عەبدوڵڵا جەوهەر ئەمەی لە پشتی نامەکەیدا نووسیووە

هاوڕێی گیانی بەگیانی من
کاکە جمال !

داری سەرفرازی خاکەکەت لە ڕەگ داکوتانایە، خوێنی من و تۆ و هەمووو دڵسۆزێکی تریش ئەو دارە ئاو ئەدا. لەبەر ئەوەشە کە ئەڵێم، خاك و نەتەوەکەت چاویان لە تۆ و هەمووو دڵ و دەروون پاکێکی ترەوەیە.
فەرامۆشیان مەکەن،
چونکە هەر ئێوەیان هەن.. !
ئیتر خۆشیتان !
لە سلێمانی
١ / ٣ / ١٩٦٠
(مۆر)
برالەت
عبدالله جوهر



# عەبدوڵڵا جەوهەر:

# ئەگەر کورد سەربەخۆ نەبێت، ئەوا دەبێت هەر ماڵ بە کۆڵ بێت!



**کاوە ئەمین**





بزاڤی ناسیۆنالیستی کورد، یان بەمانا کوردییەکەی، بیری نەتەوەیی، یان نیشتمانی، لەچاو بزووتنەوە ناسیۆنالیستەکانی نەتەوەکانی دیکە بە گشتی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەتی، زۆر بەدرەنگ فرچکی بەست. ئەگەرچی دەکرێت (مەم و زین)ی فەیلەسوف و هۆزانڤانی گەورەی کورد ئەحمەدی خانی، وەکو سەرچاوەیەکی گرنگ، کە تژییە لە هەستی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری، دەستنیشان بکەین و پاشان حاجی قادری کۆیی و زۆری دیکەیش، مەڵۆی خۆیان خستۆتە سەر شارانی نیشتمانپەروەری، بەڵام ئەو هەوڵانە هەر لە دووتوێی کتێباندا قەتیسمان و نەبوونە پڕۆژەیەک، مانیفیستۆیەکی سیاسی نەتەوەیی کوردییان لێ هەڵنەهێنجرا، کە ببێتە هەوێنی پارتێکی نەتەوەیی تا کورد بگەیەنێتە مەنزڵگەی ئازادی و سەربەخۆیی. دیارە ئەو هەویرە ئاو زۆر دەکێشێت و بابەتی ئەم وتارەی من نییە.

ئەوەی لێرەدا دەمەوێت باسی لێوە بکەم، دەوری کەسایەتییەکی گەورەی نەتەوەی کوردە، ئەویش شادڕەوان عەبدوڵڵا جەوهەرە، کە هەندێک لە هاوڕێ نزیکەکانی بە گۆمە مەنگەکەی کورد و کوردایەتی لە قەڵەمی دەدەن، ئاخر مامۆستا یەکێک بووە لەوانەی هیچ کاتێک لەخۆڕا هەگبەی دڵ و دەروونی خۆی بۆ هیچ کەسێک، تەنانەت کەسە نزیکەکانی خۆیشی نەکردۆتەوە، بەڵام کاتێک پرسیاریان لێکردووە، کانییەک بووە وشکبوونی بەخۆیەوە نەبینیوە.

ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەر، هەر لە سەرەتای گەنجێتییەوە هەستی بە ستەمکاری سەر نەتەوەکەی کردووە و ئازادی و سەربەخۆیی کوردی تەنیا لە ڕێکخراوێکی نەتەوەی کورد دا بینیوەتەوە، بۆیە لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا لە شاری کەرکوک، ساڵی ١٩٣٨ لەگەڵ دڵـداری شاعیر و نوری شاوەیسدا، بەشداری لە دروستکردنی ڕێکخراوی سیاسی ( (کۆمەڵەی دارکەر )) دەکات. هەروەها یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی حیزبی نەتەوەیی کورد.

ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەر، یەکێک بووە لەوانەی لە سەرەتای ساڵانی چلەکاندا، کاتێک شۆڕشی بارزان هەڵدەگیرسێت و لە ساڵی ١٩٤٣مستەفا بارزانی لە سلێمانی دەبێت، هاوکارییەکی زۆری بارزانییەکان دەکات، ئەوەیشی لەسەر بنەمای کوردبوون و هەستی نەتەوەیی کردووە.

ڕەنگە یەکێک لە سیفەتەکانی ماموستا، کە لە زۆرێک لە ڕۆشنبیرەکانی سەردەمی خۆیدا نەبووە ئەوەبێت، هیچ کاتێک هەڵگری بیروباوەڕی چەپێتی و کۆمۆنیستی نەبووە و ئەندامیان نەبووە، واتە لە قوتابخانەی کۆمۆنیستییەوە نەهاتۆتە ناو بیری نەتەوەیی و کوردایەتییەوە، ئەوە لەکاتێکدا بـووە کە ئەو سـەردەمـەی ئـەوی تێدا ژیـاوە، ڕووناکبیر و خوێندەواری کورد وەکو پوورەهەنگ لە دەوری ئەو بیروباوەڕە کۆبوونەتەوە، کە زۆربەی جار لەسەر ئەساس و بنەمای ئابووری هاوبەش نەتەوەی کوردیان وەکو نەتەوە دانەناوە، چونکە بە قەولی ئەوان، گوایە کورد ئابووری هاوبەشی نەبووە، بۆیە کردویانەتە پاشکۆی نەتەوە و وڵاتە داگیرکەرەکانی کوردستان. بەڵام بە پێچەوانەوە ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەر، لە سەرەتای هەرەتی لاوێتیدا، لەو کۆڕ و کۆبوونەوانەدا بەشدار دەبێت، کە باسی سەربەخۆیی کورد و نیشتمانەکەی، وێردی سەر زمانیان دەبێت.

ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەر، جگە لە سەربەخۆیی، هەموو چارەسەرێکی پرسی کوردی بە فشەچارەسەری لەقەڵەم داوە، بۆیە ڕاشکاوانە گوتوویەتی: "هەتا کورد سەربەخۆ نەبێت، هەر ماڵ بەکۆڵ دەبێت." هەستی نەتەوەیی ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەر، وای لێدەکات بەشداری لە دروستکردنی کۆمەڵەی ئـازادی و ژیانەوە و یەکێتی کـورد (کاژیک) دا بکات و یەکێک دەبێت لە حەوت دامەزرێنەرەکەی ئەو ڕێکخراوەیە. ماموستا عەبدوڵڵا، هاوڕێیەتییەکی زۆر پتەو و نزیکی لەگەڵ ماموستا ئەحمەد هەردی دەبێت. ئەحمەد هەردی یەکێک دەبێت لە دامەزرێنەرانی کاژیک. هەروەها کاک عەلی سام ئاغا کە دواتر دەبێت بە ئەندامی کاژیک و تەنیا لە چوار کۆبوونەوەی ئەو ڕێکخراوەدا بەشداری دەکات و دەستبەرداری دەبێت، بەڵام ئێستایشی لەگەڵدا بێت، کەسێکی تا سەرئێسقان نەتەوەیی و سەربەخۆیخوازە. بە وتەی کاک عەلی سام ئاغا، دوای وازهێنانی ئەو لە کاژیک، ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەریش واز لەکاری حیزبایەتی ناو کاژیک دەهێنێت، بەڵام هیچ کاتێک دەستبەرداری بیری نەتەوەیی و سەربەخۆیی نابێت و هاوڕێیەتی لەگەڵ ماموستا هەردی و کاک عەلی سام ئاغا و هەڵگرانی بیری نەتەوەیی درێـژەی دەبێت. بەوتەی کاک عەلی سام ئاغا، هاتنە دەرەوەی ئەوان لە کاژیک، لەسەر ڕووداوی کانی ماسی بووە، کە تێیدا چەند شیوعییەکی تێدا دەکوژرێت و ئەو تاوانە دەخرێتە ئەستۆی کاژیک، ئەوە لە کاتێکدا بووە کە کاژیک وەکو ئەندامەکانی دەڵێن، بەهیچ شێوەیەک دەستی لەو کارەدا نەبووە، بەڵام کاتێک داوا دەکرێت با کاژیک بەیانێک دەربکات و خۆی لەو کارە بێبەری بکات، ئەو کارە ناکەن، ئەوەیش لەسەر بنەمای ئەوە بووە کە شتێک ئەوان نەیانکردبێت چ پێویست دەکات بەیانی لەسەر دەربکەن. عەلی سام ئاغا واز لە کاژیک دەهێنێت و عەبدوڵڵا جەوهەر کە لە دامەزرێنەرانی کاژیک بووە، تەنیا شەش مانگێک لەناو کاژیکدا دەمێنێتەوە، دەستبەرداری کاژیک دەبێت. پاش دوو ساڵ، ماموستا فەرەیدون عەلی ئەمینیش دەست لە کاری حیزبایەتی ناو کاژیک دەکێشێتەوە.

گۆمە مەنگەکەی بیری کوردایەتی ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەر و چەند هاوڕێیەکی دوای کاژیکیش، لەسەر هەمان ڕێچکەی کوردایەتی خۆیان درێژە بە کاری سیاسیی خۆیان دەدەن و بیر لەوە دەکەنەوە ببنە پێشمەرگە لە شۆڕشی ئەیلولدا، بەڵام بەنیازی ئەوەی، ڕێکخراوێک یان کۆمەڵەیەک دامەزرێنن، هەم پشتیوانی سەرکردایەتی شۆڕش بکات و هەمیش درێژە بە بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی بدەن، بۆ ئەو مەبەستە (ئەحمەد هەردی، عەلی سام ئاغا و عەبدوڵڵا جەوهەر) بڕیار دەدەن بچنە دەرەوە. ماموستا هەردی لەگەڵ بابەکر ئاغای پشدەر، بەرەو ناوچەی ئاسۆس دەڕوات، بەو ئومێدەی هاوڕێکانی دیکەیشی دوای چەند ڕۆژێک بەهەمان مەبەست بچنە دەرەوە، بەڵام مەنعەتەجەولەکەی شاری سلێمانی بەسەردا دێت، کە لە کۆتاییدا بە دەیان کەسیان لە سلێمانی کوشت و سەدانی دیکەیان خزاندە ناو بەندینخانەی حامیەوە، "پارکی ئازادی ئێستا". ئەوەیش دەبێتە هۆکارێک کە پلانی چوونە دەرەوەیان سەرنەگرێت و ماموستا هەردی دوای مانگ و نیوێک دەگەڕێتەوە بۆ ناو شاری سلێمانی.

پایزی ساڵی ١٩٦٤، ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەر و هاوڕێکانی، کە زیاتر لە سێکوچکەیەک دەچـوون (هـەردی، عەلی و جەوهەر)، دەچنە گوندی ئاوکورتێ بە هیوای ئەوەی بتوانن بیری نەتەوەیی خۆیان بڵاو بکەنەوە، بەڵام باڵادەستیی پارتی و شۆڕش کە بەشێکی زۆری کوردی لە خۆی کۆکردبووەوە، ئیدی کێ گوێ بۆ سێ ئەفەندی شاریی دەگرێت. لەو ماوەیە کە ئەوان لە ئاوکورتێ دەبن، بارزانی و پێشمەرگەکانی سەردانی ئەو گوندە دەکەن، لەسەر داوای ماموستا عەبدوڵڵا جەوهەر، شەوێکی درەنگ سەردانی بارزانی دەکەن و لێیان دەپرسێ، ئێوە بەنیازی چین و دەتانەوێت چی بکەن، پارتین؟ ئەوانیش لە وەڵامدا دەڵێن، نەخێر پارتی نین، بەڵام دۆستی پارتین و بە دوور و درێژی باسی بەرنامە و



بیروباوەڕی خۆیانی بۆ دەکەن. بارزانی لە وەڵامدا پێیان دەڵێت، بەداخەوە کە من ناتوانم هاوکاری مادیتان بکەم، بەڵام بڕۆن بیروباوەڕی خۆتان بڵاو بکەنەوە و کەس حەددی نییە بێتە سەر ڕێگاتان.

هەر لە شۆڕشی ئەیلولدا، لە نامەیەکدا داوا لە مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر دەکرێت کە بچێتە دەرەوە، هاوبیرە نەتەوەییەکانی، مامۆستا فەرەیدون مەلا عەلی دەنێرن وەکو نوێنەری خۆیان تا لە ڕەوشەکە ئاگاداریان بکاتەوە، بەڵام پاش چەند مانگێک دەگەڕێتەوە و پێی وا دەبێت، باشترە لەناو شاردا بمێننەوە و درێژە بەکاری نووسین و ڕووناکبیری خۆیان بدەن.

عەبدوڵڵا جەوهەر، جگە لەوەی کەسایەتییەکی نەتەوەیی دیاری کوردایەتی بوو، بەشێکی زۆری ژیانی بۆ سیاسەت بەمانا تیۆرییەکەی دادەنێت، هاوکات خاوەنی قەڵەمێکی بە بڕشت بووە و شارەزاییەکی باشی لە زماندا هەبووە و لە بواری نووسینی شیعر و چیرۆک و وەرگێڕاندا، ئەسپی کوردایەتی خۆی تاوداوە. بە بەردەوامی لە نێوان سالانی ١٩٣٩ — ١٩٤٩ لە گۆڤاری گەلاوێژدا بە ناوی خوازراوەوە پەخشانی هونەریی و کورتە چیرۆک و بابەتی ڕەخنەی ئەدەبیی بڵاو کردۆتەوە. لە نووسینێکدا کە بەناوی ع چالاک لە ژمارە ٣ و ٤ ی گۆڤاری گەلاوێژی سالی ١٩٤٢ دا بڵاو کراوەتەوە، داوا لە خوشک و برایانی کوردی دەکات، وڵاتی خۆیانیان خۆشبوێت و لە خەوی خەفڵەتزەدەیان بەخەبەر بێنەوە و یەکبگرن: "ئێمە بۆیە لە دایکبووین کە خوێنمان لە ڕێی نیشتمانی پیرۆزدا بڕێژین و لەشمان بکەینە سەنگەری. گەل داوای ئیشمان لێ ئەکا نە قسە." عەبدوڵڵا جەوهەر لە سالانی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا وەکو لاوێکی نیشتمانپەروەر، هەست دەکات کوردستانی داگیرکراو تەنیا بەهێز و بازووی پیاوی کورد ڕزگاری نابێت، بۆیە ڕوو دەکاتە ژنانی کورد و داوایان لێ دەکات، شان بەشانی پیاوانی کورد، بێنە مەیدانی تێکۆشان و خۆیان هۆشیار بکەنەوە و لە پێناو نیشتماندا تێبکۆشن.

مامۆستا عەبدوڵلا جەوهەر، وەکو کەسایەتییەکی نەتەوەیی خاوەن بیروباوەڕ، لە لایەن خەڵکانی نەتەوەییەوە پرس و ڕای پێ کراوە. کاک ئازاد مستەفا سەرۆکی پاسۆک، لە نامەیەکدا داوا لە مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر دەکات، کە بچێتە ناو پاسۆکەوە و ببێتە ئەندامی سەرکردایەتی ئەو پارتە، بەڵام بەهەرهۆیەکەوە بێت، مامۆستا جەوهەر داواکەی قبوڵ ناکات. بەداخەوە کاتێک چاو لە هەڵسوکەوتی کەسە نەتەوەییەکان دەکەین، زیاتر لە بواری تیۆریدا ئەسپی خۆیان تاوداوە و لە کاری پراکتیکیدا خۆیان گۆشەگیر کردووە، مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەریش بەدەر نەبووە لەوان، بەڵام ئەو بیروباوەڕەی ئەوان لەسەردەمێکدا لە دەوری کۆبوونەوە، تەوژمی کۆمۆنیستی و عێراقچێتی، باڵی بەسەر کوردستاندا کێشابوو، بۆیە ئەگەر بیرە کوردستانییەکان لە بازنە داخراوەکاندا قەتیسیش مابێتن و نەیان توانیبێ سنوورە دەستکردەکان بشکێنن، ئەوا لاپەڕەیەکی گەشیان بۆ خۆیان تۆمار کردووە. ڕۆژێک هەر دێت بیری نەتەوەیی و نیشتمانیی باڵ بەسەر ئەم وڵاتەدا بکێشێت، پاسۆک دروشمێکی جوانیان هەبوو و ڕاستیشیان کردووە کە گوتویانە "هەر کاروانێک بۆ پرشنگی خۆر بڕوانێت، کەمبن یان زۆر، دەگەن بەخۆر."

**سەرچاوە:**

*گفتوگۆیەکی تایبەتی بەندە لەگەڵ مامۆستا عەلی سام ئاغا، لە دەرفەتێکی دیکەدا و لە پڕۆژەیەکی تایبەت بەبیری نەتەوەیی، هەمووی بڵاو دەکەمەوە.

*عومەر مەعروف بەرزنجی، بەڵگەی زیندوو، سالی ٢٠١٠

گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٣ — ٤، سالی ١٩٤٢

*دەستنووسێکی کاک جەلالی حاجی دەروێش، کە نووسخەیەکم لە خۆی وەرگرتووە.





ئەحمەد حسێن

# مرواریەکانی ناو دڵی عەبدوڵڵا جەوهەر

لە ئامێزی خەیاڵێکی چڕوپڕ و وروژێنەرەوە.. گیرسانەوەیەک هێڵێکی ڕامانی بۆ کێشام.. خەیاڵێک لە ئاوێتەی واقیعدا، دەمێک بوو وەک کەسێکی نامۆ چاوەڕوانیم دەکرد، تاکو ببێتە میوانی سەنگینی هەستم.. ئەوەی مەبەستی دێرینەمە، ئەو هەناسە شوێنەوار گەرمە، لە نزیکەوە ببینمەوە، تا لە پەراوێزی ڕێژنەی هزرە پڕ لە کەف و کوڵەکانیدا، وچانێک بگرم و بحەوێمەوە.. شەپۆلی بێ پێچ و پەنای ئەو خەیاڵە لای ڕوونبوو، کە چەندە بۆ شەونمی سەر گەڵا و پەڕە ناسکەکانی گوڵە لەبەرچاو ونبووەکە بە پەرۆشم.. ئای لە داخوازی بنەڕەتی یەکە یەکەی ژێیەکانی هۆشم!! ئەڵبەتە فریشتەی هات ئەمجارە بەتایبەتی لای لێکردومەتەوە.. لێشاوی پەژارە و نیگەرانی بۆ ماوەیەک لێ دوورخستومەتەوە.. دەیەوێ، دۆخی تینوێتی لەمەوپێشم بەدەرکەوتنی ئەو شکۆیە تەواو بشکێنێ.. تەوژم و گڕی سەختی برسێتی هەناوم لەو پێناوەدا بە تێشووی ئەو مژدە پڕ خێر و بێر و پەلهاوێژە ڕاستەوخۆ دابمرکێنێ.. ئەوە بوو ڕازەکان هاتنە زمان، لە درێژەی گەشتی ئەو خەیاڵەدا هەنگاوم نا.. لەخۆمەوە بۆ خۆمێکی لە خۆم خۆشەویست تر گەڕام.. لەخۆمەوە بۆ خۆمێکی خەمخۆر تر و چاپوک تر و خۆنەویست تر گەڕام.. لەخۆمەوە بۆ خۆمێکی پەروەر دیار تر و ژیار تر گەڕام.. لەخۆمەوە بۆ خۆمێکی گوێ گوێ سووکتر و بەئاگا و ئاگادار تر دەگەڕام.. کەواتە

خەیاڵەکەم نەزۆک و بستەباڵا نەبوو.. وەجاخ ڕوون بوو، باڵای گەیشتبووە دامێنی دووندەکانی پیرەمەگرون و ئەزمڕ و گۆیژە و بەرانان، لەوێشەوە دەفڕی و سنووری دەبڕی، بۆ بەسەرکردنەوەی دەشت و پێدەشت و گردۆڵکە و باڵای چیا سەرکەشەکانی تری نیشتمان.. بۆیە تا ماوم شانازی بە تان و پۆی ئەو خەیاڵە کەسکەوە دەکەم.. ئەوەندەی نەبرد کەوتم بەسەر لێکدانەوەیەکدا، کە بردمیەوە بۆ پتر لە چارەکە سەدەیەک لەمەوبەر، هەڵوێستەیەک ڕوو بەڕووم بووەوە.. تارمایی هەیبەتێکم لە ئامێزی یاددا بەرچاوکەوت.. بەرەبەرە لێی نزیک بوومەوە تارماییەکەش ڕوونبووەوە.. دیمەنێکی بۆ شناخ و سەرنجڕاکێش خۆی نیشاندا.. مرۆڤێکی هەر هێمن و کەمدوو، باشدوو، سەر سپی، ڕانکوچۆغە لەبەر و جووتێ کڵاشی کوردی لەپێدا، بەڕوویەکی خۆشەوە دەرکەوت. ئەمەندە پیرۆز بوو نموونەی کوردێکی کەلەپووری ڕەسەن.. خاوەن شارایەک لە هەڵوێستی پەسەن.. دەسووڕایەوە.. دەمێک لەناو باخی کتێبدا چاوی دەگێڕا و بۆنی چەپکەکانی دەکرد.. دەمێ لە دەرەوەی کتێبخانە نەرمە پیاسەیەکی دەکرد.. دەمێ لە گۆشە و چایخانەکانی مام عەلی و شەعب دا دادەنیشت لەپاڵ نۆشینی چاییەکەدا، چاوێکی دەگێڕا، کۆڕێکی بچکۆلانە ساز دەبوو.. گوێی بۆ وتە و بۆچوونی ئەهلی قەڵەم دەگرت و لەسەرخۆ وەڵامی پڕ بە پێستی پرسیارە کاریگەرەکانی دەدانەوە.. ڕوانین و پەرەگرافەکانی بەدوای یەکتردا دەخولانەوە. کات لەخۆیەوە دەڕۆیشت.. دیمەنێک لەگەڵ ئاسۆدا دەدوا.. سروە مووە سپیەکانی سەر و قژی بۆ ئەو لایە دەلەرانەوە کە مەبەستی بوو.. ئەو دەمە خەیاڵ وردە وردە منی لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچ کرد تا بگەمە بەرامبەری.. چی ببینم؟ ڕوانیم ئەو کەڵەمێردە خاوەن ڕابردووە پرشنگدارە، ئەو قەڵەمە بە پیت و بەهرەدارە، مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەرە.. چاوەکانی فرمێسکیان تیا قەتیس بوو.. گەرووی پڕ لە هەناسەی سارد و گەرم.. حاڵی بووم، ئەسرینەکانی بۆ بێ خاوەنیی خاکی نیشتمان بوو، کە خێر و فەڕی بۆ داگیرکەران بوو، ساردی هەناسەی بۆ داماوی و بێ ئاگایی زۆربەی تاکی کورد بوو کە بە ملکەچیی تەمەنی پڕ لە زەحمەتیان دەبردە سەر.. گەرمی هەناسەیشی بۆ ئەو نەوە پێگەیشتووە تێگەیشتووە کارایانە بوو، کە بە بەرگی ڕۆشنی و قایمی و نەتەوەیی و ئەدەب و زانستەوە.. بەچەکی هونەر و ڕەخنەی بابەتییەوە، ڕێگەی خەبات و ئاشتی و بەرگرییان گرتبووە بەر.. ئەمە جوانترین دیاردەی بەرچاوڕوونی بوو لە لای ئەو... هەر جار بەجار لە بەرخۆیەوە دەدوا و ئاخێکی قووڵی هەڵدەکێشا. گەرما و گەرم لێم پرسی ئەی پیری ئەدەب و بیرمەندی نەسەب! ئەی گەنجینەی ڕازەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ، لە تێکرای وتن و چرپەکانت گەیشتم، بەس کڵپەی ئاخەکەت وەک گڕییەک لە بۆشایی دڵمدا ماوەتەوە.. فەرمووی گوێم بۆ ڕادێرە، هەرچی ئاخەکەمە هەم گرنگە، هەم گزنگە، سێ ڕەهەندی لێدەبێتەوە:

یەکەم: کنەکردنە بۆ یەکڕیزیی و تەبایی و ڕێزگرتنی بیروڕا جیاوازەکان.

دووەم: ئازادی سەرانسەری خاکی بەرینی کوردستان..

سێیەم: پەیوەستە بەشێوەزاری یەکگرتوو، زمانی گەلاوێژ و هیوا و ڕۆژی نوێ کە لەم پایتەختی ڕووناکبیرییەوە، لەم ناوەندی بلێسەی هۆشیارییەوە، بانگەوازی بۆ کرا، بەرنامەی تێر و تەسەلی بۆ داڕێژرا، دەرگەی ئاسانکاری و وردەکاری بۆ خرایە سەر پشت. هەر لە مێژەوە لە لایەن یەکە بەیەکەی قەڵەمە بلیمەتەکانەوە سەبارەت بەم کێشە ئاڵۆزە گفتوگۆی لەسەر کراوە.. ئیتر درەنگە ئەگەر بڕیاری بەویژدانانەی لەسەر نەدرێ و بناغەیەکی سەخت و پتەوی بۆ دانەڕێژرێ و بەرەو پێشەوە نەچین بۆ یەکلاییکردنەوە، ئەوە غەدرێکە لە خۆمان و لە وشەی زێڕینی کوردی دەکەین... دەڵێمەوە وەخت بەسەرچووە، با تاوێری قێزەونی کەمتەرخەمی لەسەر ڕێگەماندا لابەرین.. تکایە ئەم پەیامەم بەزووترین کات بگەیەنن بەجێی خۆی.. بڵێن ئەمانە بوو مرواریییەکانی ناو دڵی پاکی کوردانەی عەبدوڵڵا جەوهەر... ئەمە دوا ئاوابوونی ئەو هەیبەتە زەردەپەڕە بوو لەبەرچاوی من... وتم ئافەرین گەورەم بەڕاستی نەمریی ئاوا دەبێت و ئەوا پەیامەکەم گەیاندی.

***

**عەبدوڵڵا جەوهەر**

**خۆر تاڵێکی لێ هەڵوەری**
**تاریکی هات هەڵی لووشی**
**ویستی ناوی ڕەشکاتەوە**
**بەڵام بێ سود بوو ڕتووشی**

- - -

**مەرگ هاواری لێ هەستا**
**وتی: من لەکەس نابوێرم**
**لەبوونی من بەتین ترە**
**سەیرە بەم پیاوە ناوێرم**

- - -

**وتی: ئەی مەرگ! ئەی تاریکی!**
**چەندە هێرش بکەنە سەرم**
**پشت نەستوورم بە گەلەکەم**
**چونکە عەبدوڵڵا جەوهەرم**



# دایەگیان





تێبینی:

ئەمە بەشێکە لە هەڵبژاردەی تێکستی (دایە گیان) کە لە ساڵی ١٩٤٨ نووسیوویەتی، بۆیەکەمینجار ساڵی ١٩٩٩ دەزگای زاموا بۆ پاراستنی دەستنووسە کۆنەکان چەند ژمارەیەکی کەمی لێ چاپکردووە، ئەمساڵیش لەگەڵ ئەم ژمارەیەی ڕۆڤاردا دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بە کتێبێکی تایبەت و لەگەڵ ڕۆمانی (بەرەو کوردستان بە مشتێ خاک و خۆڵی هەورامانەوە) چاپیکردووە، ئەمە جگە لە بەشێکی زۆری وتارەکانی بەهاوبەشی دەزگای ژین لەبەرگێکی نوێدا کۆیکردوونەتەوە.

ڕۆڤار

**عەبدوڵڵا جەوهەر لە بارەی دایە گیانەوە ئەم چەند دێڕەی نووسیووە:**

ڕەنگە کەمێکی ئەم قسە پەشۆکاوانە، لە هەندێ کەس وابێ لە شیعر بچن. بەهەڵەدا ئەچن و سەنگیان سەرئەکا ئەگەر وەها بیر لە ئاواز و چێژی گوڵ بەدەمیی و ناسکیی سەد تەرزەی شیعر بکەنەوە.
نە ئەزانم هونەری شیعریی بەری وا بەکوێوە، نە سەر لە بەهرەی نووسینیش دەرئەکەم.
چەندیشم بەدڵە ئەگەر واش نەزانرێ ئەم چەند ڕیش سوور هەڵپڕووکاوانەش هەمزاغابن. چونکە لە کەساسی و بێزمانیی چەند بەیاییەکی لنگەو تلووری ژاناوی زیاتر هیچی تریان پێوە دیار نییە. تەنها وڕێنەن و قسەی ڕووتن، دراونەتە دەم یەک و بەس!.

## هەناسە ساردیی

لەم ڕێگا و بانە تووشەی وا کوێرانە پیائەڕۆم
دڵی پێ سووتانە بەدڵ سووتاوانی وەکو خۆم

چاو گێژە و دڵ سەرپشکی هەستە بە ژانەوە
سەر ڕێژە و کرمەڕێزە جەستە بە ڕانەوە

ئەندێشەی کۆن هەرچەن ئەنێم بە جەخارمەوە
لە شەرمەتای ژێر دەستییا چاوەشارمەوە

ڕیز کراوە ڕستەگلێنەی چاو دەرهێنراو
ناو زڕاوە هەڕاجی لەشەو شەرەف پێکراو

ساڵەهایە خوێن تێوەدان چزوو پێوەدان
هێشتا هەر گەرمە پەڵپی خۆ بەدەستەوەدان

ڕۆژ دڵ کرمانە شەو داهات هەست قرنجانە
پیشە ترسانە و لە قاوغ تێ ترنجانە
هەموو لە گۆڕانان ئێمە نەبین وەستاوین
جەژنی داگیرکەران جەژن و ئاوی دەستاوین

وەک لێمان بێ نەگۆڕان لەبەرگی لە جەرا
دەس لە خوێنی یەکو سەر لەڕێی داگیرکەرا

چۆن بووە و چۆنە خاکەکەی دایکی نیشتمان
ناپرسێ کەس لە بەختەکەی نەنگە ویستمان

سەر لە لەش کراوە ئەشبێ نەتەوێتەوە
وەک ئەبێ چاو بەچاو ئیتر نەکەوێتەوە

لە گوێی لاوکا عەتابە دەنگ ئەداتەوە
لە نێی شمشاڵ ڕەبابە پەنگ ئەخواتەوە

******





## نائومێدی

به هیواوه هەزاران ساڵه چاوەچاوین
دیاره هەر به درۆ زیرەک و ئازا و پیاوین

مل شکاوی ڕۆن و پیاز و کەم دەرەتانین
لەکوێ لووتمان چەور کەن لەوێ چەک بەشانین

چەشەی ڕاوین و له تێبەردانا بەتاوین
سفرەدڕ نین و به تێشوبەرەی ڕاو ماوین

پۆڕی خوراو مردووی بەشی زیندووخۆر خۆمان
ڕیخۆڵه ڕژاو برزووی سەرو گوێلاک شۆڕ خۆمان

*****

## نۆکەریی بێگانه

له لانکەی ئادەمیزاد و دەریای گەرداوا
ئێمه بووین پەرچەمی داد و خولیای ڕۆژئاوا

زردەشتی مەشخەڵ، ئەمڕۆ خۆڵەمێشی ڕووته
ئازادی و بیری نوێ دیلییان لەگەڵ جووته

شەو داهاتووه خەرمانەی داوه سەرشۆڕی
ڕەفتار تیا چووه ترس کراوه به گەرمه گۆڕی

خواست له دەروون و حەزمان له دڵ دەرکراوه
له شیرین خەوا ڕەزمان گڕ تێ بەردراوه

بەو دەردانەوه ماوەتەوه کاری بۆمان
سەری خۆمانمان داوەته بەرداری خۆمان

بەربووینەته ڕمان و شکانی پەل و پۆمان
کەوتووینەته پسان و دڕانی تان و پۆمان

خول ئەخۆین له بۆشاییا و خوێن ئەخورێتەوه
وەک ئێسک و گیانی کورد ئیتر هەر نەبووژێتەوه

زامی کەڕەواڵییمانه ئەکولێتەوه
تیشکی خۆماڵییمانه وا ئەکوژێتەوه

بەڵام هەر سۆمای چاوی دوژمن ڕوون بێتەوه
کوێر بێ با چاومان ناسۆریش نەڕەوێتەوه

گێل و سەرلێشێواو هەریەکه سەر به مەرزێ
وێڵ و هۆش ناتەواو هەر بێ فەڕەش به تەرزێ

دەسی ناپاکییشی بەشەرمەوه بلەرزێ
هەر له سەنگەری خزمەتکارییا دامەزرێ
چش له پیاوەتی ئەکا و تف له گشت سەربەرزێ

******

عبدوڵڵا جوهەر





## گۆڕ هەڵتەکان

هەزاران ساڵە ئەوەی لێمان وەشاوەتەوە
سوارەی خەڵقین و شڵپی تەڕمان بۆ ماوەتەوە

وەک دزرابێ لە چاومان کلیپلی ئاوی ڕوومان
بەفیڕۆ چووە عومری شەرەف بەباچوومان

باوەڕ بەخۆی جارانیش فریشکی کەوتووە
گەنم بەجۆی دۆڕانیش دیپلی تیا خەوتووە

شەرەفمان دۆڕاوە زەردە ڕەنگ و ڕووی خوومان
جا کوردمان ونە؟ یا کوردستان؟ یا هەموومان؟

لە قوڕگی سنگ شێرییا پاڵمان داوەتەوە
لە بەرگی بێ خێرییا جاومان ناوەتەوە

تا چاو بڕ ئەکا چوار ناڵەی داگیرکەرانە
پاسەوانیش سوارەی کوردی دەس بەسەرانە

نە نیشتمان نە کاڵای زمان لەقەد باڵایە
نە سەربەستی نە سەربەخۆیی نە ڕەنگ ئاڵایە

گومانی ئاڵاش لە ناخا وا جیڕ بۆتەوە
بوون و نەبوونی لە داخا لە بیرچۆتەوە

ڕەنگ و بۆی ئازادی ئەوەندە بەری دوورە
ناناسرێتەوە چ ڕەنگە، زەردە یا سوورە؟

نازانین چاوی سەربەستی تیژە یا کوێرە!؟
چێژ و تامی، هەست و نەستی، مزرە یا سوێرە!؟

******



## کام برایەتی؟

لەپاڵ دەستەبەرە و چڵ و چێوی ڕووزەردییا
چاوباشقاڵە ناپاک لە هەڕەتی نامەردییا

بەخێسەی بەدکار پشتی پیاوەتی شکاوە
بە پەرچ و پوازی ناوخۆ ناوی ڕوو تکاوە

هەر کوردە ئاوەکییانە گەڕ و گول ئاودامان
باوەڕی ئاوەکیی ئەکرێ بە دڵ و بە گیان

هەرا و هوریای لاوان شڵەژانی وا لەبەرا
کوردن بەدەنگ نیازی دوژمنیان وا لەسەرا

درۆزنتر لە برویبیانووی عەبا و پەچە
درۆیان لە باوەش بێ شەرمییا ملکەچە

کۆتری گوایە ئاشتیی چاوی باز دەردێنێ
ئومێدی درۆ سەر لە ڕاستیی ئەشێوێنێ

گرێی برایەتیی مشتووی ناو هەمانە بۆرە
ئاغای داگیرکەریش کەڵەگا و کەلانە خۆرە
بۆیە کوردی سەرشۆڕ هەرتاوە و پاوانە شۆرە

بە ئاغا و بە سەپانیی برا ژەندنەوە
کۆڵەوار بە پەیمانی فریو خواردنەوە
کێوکێڵن بە فەرمانی سەرهەڵگەندنەوە

دڕکە بەشیان بە خەرمانی سوورکردنەوە
گوڵی گەشیش هەروا بە یەخەی دوژمنەوە

برایەتیی پیشەی دڵ و دەروون پیسانە
کوردایەتی ڕیشەی هەر بێ ناو و نیشانە

نابێ بزانین گەر ئازا و زیرەک و ژیرین
ئاخۆ بەکام چاکەی برایی نمەک گیرین؟

چەند شەرمە بەو درمەوە کە برایی ناوە
ناڵە ناڵ و گرمەی تۆڵە بخەینە لاوە!

*****

عەبدوڵڵا جەوهەر



## کۆماری مەهاباد

جانەوەرانی عەجەم لە کورد وورووژابێ
خوێنی کۆماری سەربڕاو تەڕ تەڕ ڕژابێ

بە ئێسک و پروسکا مۆخی سەر پژابێ
ساوای دایک کوژراو لە لانکەدا برژابێ

لە مەیدانا لاشە گەرم و گوڕ بەجێ مابێ
نامۆیی دڵ لە ئاواتی گلاو تێ مابێ
چاوی ئومێد بە عاستەم تروسکەی تیا مابێ

کەڵەپیاویش گەر مابێ لەعاست خۆی دامابێ
دوژمنیش لە دووگی چەوری کوردان ڕامابێ

چەند شەرمە لەڕێی شەرەفا پێ دزکێ هەرمابێ
ئاگرە سووری لەخۆ دووری حوکم فەرمابێ

هەستی یەکماڵیی وەک لە دەمارا نەپەنمابێ
بەزم گەرم بێ وەکو هیچ هەر هیچ نەقەومابێ

ڕاستە ئاگر بێ دووکەڵ چەمیش بێ چەقەڵ نابێ
واش دیارە کورد لە دەما ئەو لغاوەی هەرمابێ

کە ئەبێ هیچ هەوێنی ڕزگاری پێ نەمابێ
بۆ بێگانە هەر ئەبێ لەژێر باری خەمابێ

*****

## گیانی دایکێتی

لە مەشق و بەرنامەی سەرکۆشی دایکێتییا
لە بۆن و بەرامەی زۆر خۆشی پاکێتییا
لەکار و کارنامەی پەرۆشی چاکێتییا

تەنها باڵی (ئەجێ)ی کچی ئەبووە داوای
هەرچەند ئەچوو بەلایەکا (دەروێش)ی زاوای

مەگەر بەدەگمەن جاروباری لێ دەرچووبێ
ئەویش بە خەرمەن ژەنگ و ژاری دەستەدوو بێ



لەدوای چەند جارە ئاخ و ئۆفی مەرگ و تیامان
منی بێ کارە ئەبووە سەڵتەی دوای کاروان

ئەمجارەیان بەدبەختانە لە سەرەی ئەدا
درۆش نەکەم سەرسەختانە لە سێیەم شەوا

شەوێکی پەست و تووشی سەروسەنەمە خوار
نە لێواری هەبووبێ نە دەرفەت و نە بوار
شیتاڵی هەڕەشەشی پیاهاتبێتە خوار

چلەی شەوێ بوو گلی چاو دۆعا گیرا بوو
کولوە بەفری سەر بەکڵاو ترسی تێزا بوو

ئەو شەوەی دنیای ئارامی تیا شڵەژا بوو
ناپاکیی بە گیانی (غاندی) یا هەڵپژابوو

بە گوێسەوانەوە چلوورەی ستەمکاری
نەشتەری نووک تیژ و هاروهاجی پەژاری
لەوەبوون چەقیبنە گلێنەهای هەژاری

❊❊❊❊❊❊

عبدوڵڵا جوهەر





## مەرگ و خۆ بەرەستەوە نەدان

-١-

بەرەبەیانی ئەوشەوە بوو تاریک و روون
دەنگی دەرگای بە پەلەو ئاگا لە هیچ نەبوون
ناوجێی دایە بەر تەکانی بە دەنگەوەچوون

سەیر ئەکەم دایکە بەژانی لەش و لارەوە
لەژێ کووڕتر بە گینگڵدانی ئازارەوە

برێشکەیە و گەرمەتا ئەیبرژێنێ و ئەفڕێ
نزایە و بەرەو ئاسمان ئەیقرچنێ و ئەگڕێ

ڕۆڵە فەرمووی دەردکارییە و تەنها باڵییە
دوایی کۆچی بەندەگی و پەرێشان حاڵییە

هەر ئەوەندە کەوتە هەنگاونانی ناو هەیوان
بێ پەروا ئیتر ماندوو مردوو ڕەنگ پەرێشان
گەوز و تلدان بوو شیری بەرەوژوور خۆکوتان



به (قومری) و (نەسرین)ی تازە لەخەو هەڵساوا
لەگەڵ ئاخی تورت و جیڕی ناڵە وشراوا
کەمەری گیرا لە کەمەنگی حەپەساوا

وەڵامی پرس و ڕا: جارێ زیڕەمەو ماندووم
لە تاریکی شەوا دەسیان لێ وەشاندووم

- ٢ -

لەو پەشۆکاوی و داخەی ناو دڵا لەناکاو
خۆی کرد بە ژوورا دراوسێ خەمخۆری ناسیاو
دەسە خوشکی نە بوونیی پوورە (بەهێ)ی (خەجاو)

لەدوای گرتنە باوەشی یەخە دادڕان
پیاچوونەوەی هەموو کەس لە دەوری سەر گەڕان

بە سنگ کوتانەوە: لەوانی مل شکاندووە
کوێرانە ئەوانیش دەسیان پیس لێ وەشاندووە

بەڵام هەر خواخوایەو (مەلا جووکێ)ی ڕەخساندووە
پلی هەزاریانی تاکو ئێستا تەقاندووە

ئەمانەی وت و عەبای لێدا بەلای شانا
کەوتە مل ڕێ بە دوای مەلای شان و مل پانا

منی تەواو خام و هیچ نەزانی خۆش باوەڕ
گەلۆرتر لە بەرماڵ بەشانانی بۆش باوەڕ

منی گەوج و گەمژۆی ئاگا لە دنیا نەبوو
شاڵ پۆشانی کتومت لە گوێی گا دا نووستوو

پەل بە پەلی ڕاچەنینی ئاو دامانەوە
دەست و پێ لەسەر ئەرزو چاو بە ئاسمانەوە

نەفامی شەتەک دراو بە دڵ کرمانەوە
بە گەوز و تلدانی دایکی بەسزمانەوە

چاو برینە دەرگای تۆفی خەیاڵ پڵاویی
ڕەهێڵەی نائومێدی و گەشکەی بەر بڵاویی

کرۆشتنی لێوی داخ بە سەرسامییەوە
لوولیی هەناسەی سارد بە نائارامییەوە
بە دیار سەوڵ و خەرامانی ناکامییەوە

ئاخ و ئۆفیان بەپۆپەی دەسەوسانییەوە
ئەتکانە دەم ڕاووڕووی سەرگەردانییەوە

*****



# سکاڵای یەکەم شەوی بێ دایکی



عەبدوڵڵا جەوهەر



-١-

لەجێی خۆشیی دایک، خەم وا بەدیارمانەوە ئەمشەو
گریانی کڵۆڵیی، وا بەژوور سەرمانەوە ئەمشەو

دەروازەی سوێ بوونەوە، لەسەر گازی پشتە ئەمشەو
تروسکەی خۆشیی، لەگەڵ ڕەشیی خەما خشتە ئەمشەو

پەشێوی بەرێشووی خەم دادراوەتەوە ئەمشەو
پەژارە لە دەروونا، دەم کراوەتەوە ئەمشەو

بێ نازە سۆز، چاوی خۆشی، خەمی تێزاوە ئەمشەو
زامارە کۆست و کەساسیی، سەری تێناوە ئەمشەو

گوێ ئاگردانی، خوشک و براییمان، گەرمە ئەشەو
تابوشت لەتر ئەدا، خانە تاریکیی شەرمە ئەمشەو

-٢- —

لەسەر چۆکە (ئەجێ) لەبەر وێنەی دوورە دەستیتا
(قومری) و (نەسرین)یش لە دەریای پڕ لە هەست و نەستیتا
دەسیان وا لەمل تابلۆی تا بڵێی خۆشەویستیتا

منیش بە هەموو تین و توانای پاکێتیتانەوە
لێوم وا بەدەس میهرەبانیی دایکێتیتانەوە

بەڵام هەر کە هەنسکی گریان، گیان ڕائەچڵەکێنێ
گۆمی ئەندێشە و لێکدانەوەمان ڕائەشڵەقێنێ

ئاگری نەگەڕانەوەت لە گیانی من بەر ئەبێ
یاد و بەیایی، تام و چێژی کۆن، سەوداسەر ئەبێ

هەردوو دەستی شلکوتی مەرگی (ئەجێ)ی تاسەر لە قوڕنان
ئەگاتە دەموچاو ڕنینی سنگ کوتان و لەخۆدان

تەلی نازپەروەریتە بە سفت و سوێی شەیداتەوە
لە شین و شەپۆڕی (قومری) کچتا دەنگ ئەداتەوە

جوانیی چاکە لە پاراوی زمانی شیرینەوە
وەک فوارە قوڵپ ئەدا لە دڵ و چاوی (نەسرین)ەوە

# له بیرمه و چاکم لەبیره

-١-

له بیرمه و چاکم لەبیره، دایەگیان، که بەدەم لایەلایەی (جەمال)ە وه، هەرچەند ئەتانفەرموو:
(چرای بەختی قەوم و خوێشم.. ڕۆشنایی ژیانی ڕەش و ڕووتانم.. لای لایه، ڕۆڵه لای لایه..)
چاوه گەش و تیژەکانتان ئەبوونه دوو گۆم خوێن و وەک پلوسک فرمێسکیان پیا ئەهاته خوارەوه..!
ئەوه بوو جارێکیان منیش منالأنه، لێم پرسین:
دایەگیان ئەوه بۆچی ئەگرین..؟!
ئێوەش لەسەرخۆ فەرمووتان:
(ئای کوڕم.. لانەوێران خوێن.. وڵاتی به دوژمن داگیرکراو خوێن.. هەرچەند بیر له بەختی ئەمڕۆ و دوێنێی قەوم و خوێش ئەکەمەوه، موچوڕکم پیادێت..
تارمایی بەدبەختیی بەرچاوم ئەگرێ.. بەڵام چار لەدەس ئێمەدا نەماوه.. ئەبێ چاو ببڕینه منالأنی ناو لانکەکان.. بەتاسەیەوه، لای لایەیان بۆ بکەین و خەو لەچاویان خەین..)
دایەگیان، خۆشتان ئەتانزانی من لەو دەم و دووەتان نەدەگەیشتم.. لەگەڵ ئەوەشا، هەر داتان بەگوێما..
وەک پێشەکی بزانن ئامۆژگاری دایک، له هۆش و گۆشی منالأ، جێی خۆی چۆن ئەکاتەوه و چۆنیش له ناخی دەروونیا لەنگەری جێ نەگۆڕ دائەکوتێ..!
دایه گیان، هەر ئەو فەرمایشانەتانه، ئەمڕۆ دەمار ئەبزوێنێ.. چاو ئەکاتەوه.. زات ئەنێته بەر..!
هەڵمەت و پەلاماردان لەسەر دەستیا هانه هانه ئەدرێن و مژدەی ڕۆشنایی به دواڕۆژی کوردان ئەدرێ..

-٢-

ئەو ڕۆژەم لەبیره دایەگیان که بەدیار کارژۆڵەکانەوه داتان نابووم و خۆشتان بەبێڵەکانێکەوه خەریکی گژوگیا هەڵکەندن بوون.. ئا لەوکاتەدا بوو که ئێسترسوار، لەولای گردی (ئەولاغا)وه، بەلامانا ئەگەڕانەوه بۆ خێوەتگەکەیان..
لەبەرخۆتانەوه فەرمووتان:
نازانم ئەمانه بۆچی هاتوونەته سەرمان..؟!
منیش لێم پرسین:
بۆچی دایه ئەمانه چین و لەکوێوه هاتوون..؟
ئێوەش فەرمووتان:
ڕۆڵه ئەمانه عەرەبن. له عەرەبستانەوه هاتوون. ئێرەش کوردستانه، خەیاڵیان خاوه، جێی ئەوانی تیا نابێتەوه، تا کوردێکی تیا مابێ.

-٣-

ئەو ڕۆژەشم لەبیره که بەفر هەر له ئاوایی و ڕێگاوبان و جێ کرێنەکانا چوو بووەوه.. له (سەرچاوه)وه بەلای (کۆکەڕەشه)دا منت لەگەڵ خۆتا هەڵگرت و به ڕێگای (باسکه درێژ)دا بەدیوی ئاوایی (زەوێمەڕ) و (تلەزەیت)دا، داگەڕاینەوه خوارەوه.. بۆ دۆزینەوەی مانگا زەردی تەڕەو له گاگەل بەجێ ماومان.
ئەوەبوو له ڕێگای ناشیانه و بەڕەوتی منالأنەمەوه، کەوتمه باپێچێکی بەفرەوه.. تۆی ماندووش به هەزار حاڵ کەوتیته فریام.. وەختەبوو قووڵیی و زۆری بەفری باپێچ، تۆش له پەلوپۆ بخات..!
بەڵام بەبێ ئەوەی ورتەیەکتان لێوه بێ و ئاخ و ئۆفێ هەڵکێشن، یا بێزارییەک دەرببڕن، هەر که کەوتینەوه سەر ڕێگا، بەدەم دڵخۆشیدانەوه و تەکاندنی جل و وشککردنەوەی قاچ و دەس و سنگمەوه، وەک بتانەوێت مەعنای ژیانم تێ بگەیەنن، فەرمووتان:
کوڕم، ئینجا مانگا زەرد ئەدۆزینەوه.. دان بگره بەخۆتا، ئێستا ئەگەینه ناودێ و گەرمیشمان ئەبێتەوه.. شیر و ماست و کەرەی مانگا زەرد، ماندووبوون هەڵئەگرێت.. ئینسان تا ماندوو نەبێ، پشتێنی حەوانەوه ناکاتەوه و پاڵیش ناداتەوه.. که ڕۆیشتینەوه، ئەوسا تێ ئەگەی، نان و کەرەی مانگا زەرد، لەدوای ئەم بەدواگەڕانەیا.. چەند خۆشه..!

-٤-

لەبیرمه دایەگیان، ئەو ڕۆژەی ئێسترسوار، بەر دەرگای (تاوڵەی سواری)یان گرتبوو، وەک بتانەوێ، دەرسێکی ترم دابدەن.. بۆ سەیر کردن منتان خسته پەنجەرەی باڵەخانه لارو کۆم و لەچەند لاوه تەپیو و پەڕپووتەکەی (ئامینەخانی) تازه دەوڵەمەندەوه..
خۆشتان له پشتمەوه بەدەم هەنسک هەڵدانەوه،

ئەپاڕانەوە:
خوایە بەیەک نەگەن و دوژمن دڵیان پێ خۆش نەکا.

کە لێم پرسین، دایە گیان هەنسکی چی هەڵئەدەیت و بۆ کێ ئەپاڕێیتەوە.؟ ئێوەش لەبەرخۆتانەوە، فەرمووتان:
کوڕم، ئەو ئێسترسوارانە کوردن و پیاوی حکومەتی (بەغدا)ن.. ئەوەش باوکتە لەناویانا، ئەچن بۆ شەڕی کورد بە یەکادان، لەو دیو (قەرەداخ)ەوە لەگەڵ سوارەی (شێخا)..!
لە خواش ئەپاڕێمەوە، دەستیان نەگاتە یەکتر و عەرەب دڵیان پێ خۆش نەکات..!

-٥-

لەبیرمە دایە گیان، ئەو جارەی ویستان، لەو کتێبەی لەبەردەسما بوو، شتێکتان بۆ بخوێنمەوە..
منیش لێم پرسین: دایە لە عەرەبی ئەگەی تا بۆت بخوێنمەوە..؟
ئەوەبوو هەناسەیەکتان هەڵکێشا و فەرمووتان:
بەڵێ ئەبێ مناڵەکانیشمان، بە زمانی دایکیان نەخوێنن.. چونکە حکومەتی بەغدا لەئێمە نین..!
ئیتر لەوساوە، دایە گیان، مۆخت ئاودامەوە.. کە کوردیش ئەبێ حکوومەتی خۆی هەبێ و مناڵی کوردیش ئەبێ بە زمانی دایکی خۆی بخوێنێ..!

-٦-

ئەو شەوەشم لەبیرە دایە گیان، کە لە (شکنە)وە گەڕابوومەوە، هەر کە دەرگای دەرەوەتان لێ کردمەوە، دەستان کردە ملم و داتانە پرمەی گریان..
تا بە باڵەخانەکەی قالەی حەمە بێ خێردا سەرکەوتینە سەرەوە دەستان لە ملم بەرنەدا.. ئینجا بە تەوسێکەوە، فەرمووتان:
کوڕی خۆم، پێم نەوتبووی دەست بگری بەداوێنی داگیر کەرەوە و چەکی بەکرێ گیراوی بکەیتە شان و دەست لەگیرفانیا بگێڕی..
پێم وتبووی، هەر ڕۆژێ نیشمانەکەی خۆت، پێویستی کەوتە تۆ، هەرزانترین دیاریت، خوێنتە.. بەکەمی مەزانە و بەختی بکە.. چاویشت هەر لەوەوەبێ، لووت بنێ بە لووتی ئەرزەکەی خۆتەوە.. بۆنی خاک و خۆڵی خۆت بکەیت و تەنها دەستی شوانی خۆت ماچ بکەی..
کوڕم، ئەزانی بووی بە عەسکەری کێ..؟
چۆن دڵت هات، پشت بکەیتە من و.. [گریان نەیهێشت فەرمووەکەتان تەواوکەن..]
دایەگیان.. ئەوسا پەشیمان بوومەوە.. ئەوسا بەخۆم زانی چیم کردووە.. ئەوسا لەپشت کردنە دایک و دایکی نیشتمان گەیشتم..!





بەڵام ئەو کاتەی پەشیمان بوونەوە، کاڵەک بەئەژنۆ شکانە..!

— ٧ —

خۆشی ئەو بەیانییەم هەر لەبیرە کە لەحەوشەکەی (تاوڵەی سواری)یا، لە تەنیشت باوکمەوە، لەژێر ساباتەکەی بەردەم چایخانەکەی (ئەحەبابم و عەبە خورشە)دا، وەک کوڕێک بم و هاتبمە ناو پیاوانەوە، کورسییەکم بۆ جیاکرایەوە و چایەکی ڕوونیش لەبەردەمما دانرا.
بەڵام مەستیی ئەو تۆزە خۆشییە هێشتا بەری نەدابووم، دەنگە دەنگێ وریای کردمەوە.
هەر سەرم هەڵبڕی و بەلای دەنگە دەنگەکەدا کەمێ لام کردەوە، یەکسەر زەلامێکم هاتە بەرچاو، وەک شێوەشی بکەم، بەسەر دیوارێکەوە کۆماوەتەوە و چەند کرێکارێکیش لەبەر دەستیا ساجە قوڕ سەرئەخەن و خشتی کاڵی بۆ هەڵئەدەن.
پرسیم: باوە ئەوە وەستا (هین) نییە؟
فەرمووی: کوڕم ئەوە وەستا (حەمە عەلی) خاوەن ماڵەکەمانە و باوکی (حەمەمین)ی هاوڕێتە.
– ئەی ئەو پۆلیسە چەک بەدەسانە، دوور و نزیک بۆچی، بەدیاریانەوە وێستاون؟
– ئەوانەی ڕەنگە تۆ بە کرێکاریان بزانی، کرێکارنین، کوڕم. ئەوانە (ئێران)ین گیراون. تا ئەشیان نێرنەوە بۆ (ئێران) ڕۆژانە بە بێگاری ئەیانهێنن، لێرە ئیشیان پێ ئەکەن. جا ئەو پۆلیسانە بەدیار ئەوانەوە وەستاون، تا ڕانەکەن.
– چییان کردووە وا گیراون؟
– کوڕم، ئەوانیش هەروەک ئێمە کوردن. بەڵام لەلاڕێوە و بە دزییەوە، بەبێ ڕێدان سنووریان شکاندووە، هاتوونەتە (عێراق)ەوە. لێرەش کە پێیان ئەزانێ ئەیانگرن و لەدواییا ئەیان نێرنەوە بۆ (ئێران).
ئێمەش بەبێ پرس و ڕێدان، ئەگەر بچینە ناو کوردەکانی (ئێران)ی کەس و کارمانەوە، کار بەدەستانی ئەوێش، هەرپێمان بزانن ئەمانگرن و ئەمان نێرنەوە بۆ (عێراق).
دایە گیان، ئەم قسانە هەموو لێم بوونە دەم و زمان و دەنگیان لەگوێما ئەزرنگانەوە. بە عەقڵ پێ نەشکاندنی منداڵییمەوە خۆم زۆر پێوە خەریک کرد. کە بێتاقەتی نەگەیشتنە ئەنجام و شەرمی قەڵەباڵغی دەوروپشتی چایخانەکەش تەنگی پێ هەڵچنیم، وەک هەموو منداڵێک، کەوتمە باوێشکدانی خۆنەگرتن بەزۆر دانیشتن و نەجووڵانەوە.
لەوەدابووم دەست بۆ لابردنی تەپڵەکەکەی بەردەمم بەرم، باوکم بە تیلایی چاو سەیرێکی کردم و فەرمووی کەی تاقەتت چوو، بچۆرەوە بۆ ماڵەوە.
ئەوە بوو، هەر کەهاتمەوە، خۆم پێ نەگیرا، گورج باسی ئەو کرێکارانەم بۆ گێڕانەوە و لێم پرسین:
ئەوە بۆچی خاڵم و ئەوان کە لە قەراخەوە دێن بۆ سلێمانی، کەس لێرە نایانگرێ و باوکیشم کە ئەچێتەوە بۆ (قەراخ) کەس لەوێ نایگرێ؟ کەچی ئەو کوردانە لێرە ئەیانگرن و بێگاریشیان پێ ئەکەن؟
ئێوەش فەرمووتان:
کوڕم هەموو ئاغایەک لەسەر زۆرداری خۆی ئەکاتەوە و هەرگیز بەسەر زۆرداری خۆشیەوە ناچێ.
(عەجەم) ئاغای ئەوانە و (عەرەب)یش ئاغای ئێمە. هەریەکە لەلایەکەوە ئەم وڵاتەی ئێمەیان بۆ خۆیان بڕداوە و بەهی خۆیانی ئەزانن و بە لەوەڕگەی ئاژاڵیان. وەک لای خۆمان، ڕانی دێیەک نابێ بکەوێتە پاوەن و لەوەڕگەی دێیەکی ترەوە، ئەوانیش لەلای خۆیانەوە ڕێ نادەن گوایە مەڕە گەڕی سەرەڕۆ و ئاوەکی ڕانی لایەکی تر بکەوێتە ناو ڕانەکەیانەوە و شەلکە و پزو و پەتای تریان تێ بخەن. چونکە ئەوان، خۆشمان بێ و ترش، بە گەڕ و گول و لای سپڵمان دائەنێن.
– ئەی کورد بۆچی ئاغای وڵاتی خۆی نییە، ئاژەڵی خۆی تیا بلەوەڕێنێ؟
– ڕانی کورد، شوانی گورگە و بەرەڵا. کۆمەڵ کۆمەڵ ڕەویان کردووە و بە پرش و بڵاوی، هەر کۆمەڵە روویان لەلایەکە. باشیشە تا ئێستا بە مەرەیەکیان نەبردوون و زمانیش لە دەمیانا نەمێنێ و ئەستۆیان ورد و خاش نەبێ.
– باشە ئەم ڕانەی کورد، کەی کۆئەکرێتەوە و شوانی بۆ ڕائەگیرێت؟
– ئەو ڕۆژەی شوانێکی کارامە لە کورد هەڵئەکەوێ و دیسانەوە لە کۆز و پەچەی کوردایەتییا گردیان ئەکاتەوە و ئەیانباتەوە سەر کانیاوەکەی جارانی ڕزگاری و سەرفرازی باو و باپیرانمان.

— ٨ —

لەبیرمە و واش ئەزانم دوێنێیە، کەوا هێشتا

عەبدوڵڵا جەوهەر



گەلاوێژی ساڵی ١٩٣٨ لە بنج هەڵنەکەنرا بوو، هەواڵی دەرچوونم لە پۆلی سێی ناوەندییەوە بۆ چواری ئامادەیی بردەوە بۆ ماڵەوە.

پێخۆشحاڵی کەس و کار و کرێچییەکانی تری ناو حەوشەکەی ماڵی حەمە بێخێری خاوەن ماڵ، چەندی ئەخستە سەر پارسەنگی دڵ پێخۆشکردنی دایکم، ئەوەندە و زیاتری لە گوێ پێنەدانی من بەرزتر ئەکردەوە.

ناڵێم هەر هیچم پێ خۆش نەبوو، بەڵام هەستم نەدەکرد، ئەوەندەی تۆزێک ختووکەم بدا و خۆم بەسەر کەوتوو بزانم. چونکە مناڵێ تازە خەریکی گاگۆڵکێ بێ، مۆخی خوێندەواری وا زوو ئێسکی پڕناکەتەوە، پشتی هەڵسانە سەرپێی ڕاست بکاتەوە و زات بکا تەنانەت دارەدارەش بکا..

بەو کەم تەرخەمییەی خۆمەوە، هەموو هۆش و گۆشێکم لەو سەیر و سەمەرەیە ئاڵاندبوو، بۆچی ئەبێ باوکم لەوپێش نیوەڕۆ زووەدا، ئیتر بەڕێکەوت ناوببرێ یا بەهەرچییەکی تر دابنرێ، وەک پۆلیسێک کە هەرگیز، وا ڕێکنەکەوتبێ هیچ بەیانییەک لەو کاتانەدا و بەتایبەتی لەو ڕۆژانەدا کە تازە حکوومەتی بەغدا لە کێشەی ئەوەدا بوو دەسەڵاتی ئەمن و ئاسایشی خۆی لە ناوچەی پشدەردا جێ بکاتەوە، فەرمانی بەسەرشانەوە نەبێ و بێتەوە بۆ ماڵەوە..؟

لێرەدا دیارە، ڕیس و گوریسی هیچ وەڵامێک، بەقەد ئەو پرسیارە دانایەتەوە و دەرەقەتی ڕاستی نایە، چونکە ئەوەتا خۆی دڵی خەبەری داوە و بەکەیف و چاوگێڕانێکی هەواڵ پرسینی پێویستییەکانی ناوماڵەوە، قایشەکەی پشتی ترازاندووە و دۆڵاخەکانی کردۆتەوە و پۆستاڵەکانی لێ فڕێ داوە..

ئەوەتا لەو دۆ ساردەی هەموو بەیانییەک، لە مەشکە تازە ژەنراوەکاندا بۆمان ڕۆ ئەکرێ، کاسەیەکی وا لەبەردەما..

ئەوە نییە ماندووشی حەساوەتەوە و لە زمان دایکمەوە، وەک مژدەی بدرێتێ، دەنگ و باسی دەرچوونەکەی من ئەدرێ بە گوێیا..؟

ئەمانە هەمووی لە لایە، با بێینەوە سەر ئەوەی لەمانە گشتی سەیرتر بێ، بەڵام ئەبێ چی بێ باشە..؟

بە تیلایی چاو تەماشا ئەکەم لەگەڵ گەشبوونەوەی ڕەنگ و ڕوویا، دەست بە سمێڵیا ئەهێنێ و گوێشم لێیە شوکرانەی خوا ئەبژێرێ...

بیرم کردەوە، ئەبێ سەرچاوەی ئەم خۆشییە، سروەی چ ئاواتێ بێ، وا ئەمڕۆ بەم بەیانییە گڕی داوە و خەوی پێ ئەگێڕێتەوە و هەموو گیانی هێناوەتە ملووچە کردن؟

بەپێی بۆچوونی خۆم، وتم:

بڕینی ئەم هەورازە من بڕیومە و بەلایەوە ئومێدێکی مەشخەڵدارە بەرەو ڕووناک کردنەوەی دواڕۆژێکی ماندوو حەسانەوە لە سایەیا...

بەڵام بۆچی ئەبێ ئەوە، ئاواتی سەر بەکڵاوی ئەو سەردەمەی بێ؟

چونکە وەک بێتەوە یادم، دەمێک بوو خولیایەک ناوبەناو سەری لێ ئەدا، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو هەواڵە خۆشەی دەرچوونی تەنها کوڕەکەی، لای لێ ئەکاتەوە و ئەمیش باری تکای ئەباتە لای ئەو دۆستەی لە کۆنەوە گفتی داوەتێ، گوایە کوڕەکەی هەر ئەوەندە شەهادەی ناوەندی بەدەستەوە بێ، بەهۆی دۆست و برادەرانی خۆیەوە بە (کاتبی ناحیەی) دائەمەزرێنێ..

بە چیشا ئەمزانی ئەمە سەرچاوەی دڵ خۆشییەکەی ئەمڕۆیەتی..؟ تەنها بەو نیشانەیەی گەلێ جار ئەم خۆزگەیەی ئەدا بە گوێیدا و لە زۆر دانیشتنا کە بوار هەڵئەکەوت، زووخاو و پرتە و بۆڵەی کرێچێتی و دڵی مووچە کەمییەکەی خۆی، بەو چەند دینارەی من ئەدایەوە، کە هەناسەدانێکی خۆی و خێزانەکەی پێوە بەستبوو، لە دەستکورتیی و سەختی گوزەرانا...

خۆهەڵشەنگاندنیشی لەولاوە بوەستێ لەناو هاوڕێ پۆلیسەکانیا کە نامەخوا هەر ئەوەندە تا ئێستا، وەک بزانێ، کوڕەکەی بۆی پێ گەیشتبێ و لەبەری دارێک ئەخوات کە خۆی ناشتوویەتی..

بەڵام بەبێ ئەوەی کەس، لە گەرما و گەرمی پیلان دانانا، ئاوڕێ لە گەڕ و تەشقەڵەی ڕۆژگار و کەنگ و کۆسپی بەردەمی ژیان بداتەوە و بیرێک لەمسەر و لەوسەری هیچ تەگەرەیەک بکاتەوە، مرخێش مرخێش، شان هەر لەوە ئەکوتێ باراشی تەنها خۆی لێ بکا.. تا لووتی ئەتەقێ بە لووتی گەپ و گاڵتە پێکردنی ڕێکەوت و چارەنووسا...

یا بەواتایەکی تر، هەموو هەر لەوە ئەگەڕێن، ئاوی ئارەزوو بەدەم بێڵە قوڕی خواستەوە و گوێز هەر بەباری خۆیانا بژمێرن. سەرکەوتن و دەست ڕۆیشتن بە خەو و خەیاڵەوە ببەنە سەر. بەبێ ئەوەی بیرێ لەو چورتمە گەورە یا بچووکە بکەنەوە کە لە نیوە یا کۆتایی سنگ کوتانا، دەست دێنێتە ڕێ و سووکێ لە ڕێی مەبەست لایان ئەدا و لە زمانی پێشینانیشەوە پێیان ئەڵێ:

ئاش لە خەیاڵێ و ئاشەوان لە خەیاڵێ..
ئەمەش لە باوکم و (شێخ لەتیف)ی ڕوودابوو. باوکم پەلەی ئەوەی بوو، زوو لەبەری دارەکەی بخوات.

(شێخ لەتیف)یش وەک برایەکی گەورەی دڵسۆز، بۆ هێنانەدی، خواستێکی تری درێژخایەن، بەڵام گەورەتر و پڕ لە خێر و بێرتر، لەلای خۆیەوە کەوتە هەنگاو نان. بەبێ ئەوەی هیچیان ئاگایان لەویتریان بێ. وەک دەستێک پاڵی پێوە بنێ، بۆ قرتاندنی خونچەگوڵی خواستی بە پەلەی باوکم. لە نێرینەی ئەم بەیەکادانەی بەتەمابوون و دڵسۆزییا، ئێوارەیەکیان لە نیوەی دووەمی مانگی ئەیلوول و لە باخەکەی (میللی) بەرامبەر بە مزگەوتی گەورەدا، بەگوێیا چرپانم، فەرمووی: سبەینێ ئەچم بۆ (بەغدا). تۆش وەرە، بەشکو وەک (مەحموود حەسەن و نووری کاکە حەمە و مەجید سەعید و عەزیز شاڵی و هاوڕێکانی ترت) لە هەندەسە بێ یا لە دار المعلمین یا لەهەر کوێیەکی تر بەشتی تێبکەوێ دابمەزرێیت و لە خوێندن دوانەکەوی و پەنجی چەند ساڵەت بەفیڕۆ نەڕوات. چونکە ئومێدی ئەوە بڕاوە کە ئەمساڵ (ساڵی ٩٣٨/ ٩٣٩) خوێندن بۆ پۆلی چواری ئامادەیی لە سلەیمانی بکرێتەوە. تا ساڵێکی تریش بۆچی لە خوێندن ببی. بەفیڕۆدانی ساڵێکیش هەروا گاڵتەی لەگەڵا ناکرێ.

منیش بەبێ سێ و دوو لێکردن، پێموت: باشە.
هەر کەچوومەوە بۆ ماڵەوە، بۆ باوکم و دایکم گێڕایەوە و ئەوانیش وەک باشەیان لەسەربێ، مادام ئەوە خواستی (شێخ لەتیف)ە و ئەو قسەی تیا کردووە، هیچ تەگەرەیەکیان نەهێنایەڕێ.

سبەینێ کەوتینە ڕێمان، ئەم شار دانە دەم ئەو شار بوو. لە چەمچەماڵ و کەرکووک و تووزخورماتووەوە، خۆکوتانی ئۆتۆمۆبێلە بەساڵاچووەکەمان بوو کە سەری ئەڕۆیشت و کنگی نەدەڕۆیشت، تا شارەبان و باقووبە و بەغدا.

بەڵام چۆن دانەدەم یەکدانێک؟ هەر مەپرسەی ماندووبوونی ئێمە و تەکەڵتووی پیرە ئۆتۆمۆبێلی ئەویست، بەباوەشێنی قسە و نوکتە خۆشەکانی (شێخ لەتیف)ەوە کە ئارەقی هەموو خەمێکی بەبا ئەدا.

بەهەرچۆنێ بوو، بەو هەڵوەشاوییەی لە پەلوپۆ کەوتن و گۆت بوونی قاچ و قولی هەر لە بەیانی تا ئێوارەی ناو ئۆتۆمۆبێلەکەوە، زەردەی مابوو گەیشتینە بەغدا.

لە سووچێکی بۆشایی بەردەم وەزارەتی بەرگری دا، بەلای مەیدانا، ئۆتۆمۆبێلەکەیان ڕاگرت.



**قومری تۆفیق جەوهەر - خوشکی عەبدوڵڵا جەوهەر**

شێخ لەتیف ڕووی تێ کردین و فەرمووی: باوکم ئەزانێ ئەمڕۆ من دێم بۆ بەغدا. بەڵام نازانێ بۆچی وا بەم درەنگانە گەیشتووینەتە بەرەوە.
بۆ ئەمەی ڕێ بە دڵەڕاوکێی نەدەین، حەزئەکەم جارێ با لە هیچ لایەکی تر لانەدەین. یەکسەر بچینە خزمەت ئەو. تا سبەینێش خوا ئەمێنێ و موڵکی.
سوار بووینەوە و گەڕەکی (×لێخ) و کۆشکەکەی (شێخ مەحموودی گەورە) خۆت بگرە و هاتین.
لە دڵی خۆما قریوەم لێوە ئەهات. ئای لەم خۆشییەی منی تیام..! ئەوە منم بەم ئاسانییە چاوی عەزرەتیم ئەکەوێتە فڕین و ڕێی بەرەو لانەی (مەلیکی کوردستان) ئەنرێتە بەر و بە دیداری شێری کوردان شاد ئەبم؟
ئەوە منم، خۆزگەهای دوای چەندان باس و خواسی بیستن و خوێندنەوە و تەنها سەرنج دانی وێنەکانی سەر قاقەزی، ئەبێتە یەک خۆزگەی پڕ بە دنیا و ئەویش ئەبەمە بەر بارەگای ئەو دڵە گەورەیە خۆی، بە هەموو لەش و لار و نرکەی قارەمانێتی و گرمە و ناڵەناڵی چوونەوەی بەگژ دوژمنا؟
دەوەرە گەشکە نەتگرێ... بەرکە نەکەوێ و دڵ بسرەوێ و گیان باڵ نەگرێ..!
بەم هەلەکە سەمایەی خۆشیمەوە، ڕۆیشتین.. تا لەبەر کابەی چاوەڕوانی بە ئاوات گەیشتنا، قنج و قیت هەر کە ئێمە وێستاین، ئۆتۆمۆبیلێکی تریش گڕ گڕ لە دوامانەوە، وێسا..

لەمیانا (لەتیف)ی کوڕ لە کوردستانەوە..
لەویشیانا (بابە عەلی) کوڕ لە هەندەرانەوە..
بەجووتە دەست لە دەستی برایەتییا، دوو پێپیلکەی بەر هەیوانیان، بەهەنگاوێ پێچایەوە.. یەک لەدوای یەک بەپشت دانەواندنی فرزەندییانەوە، بۆ دەست ماچکردنی کەڵەپیاوێکی داروبار قایمی، سەر کورسی گوێ هەیوانەکە، کەمێ ئەژنۆی ڕاستیان نوشتانەوە و چۆکی چەپیشیان بە تۆبە دادا..
لەسەرخۆ، مژدەی بێوەیی و لەشساغیی باوک و جووتە کوڕ تکایە زمانی پاراو و لە دەریای خۆشییا لەنگەریان بە کەشتی سەرنجدان گرت و نەرمە بای شەپۆلی زەردەخەنەی پێخۆشحاڵی کەوتە شنە.
منیش هەروا لە خوارەوە چاوم بڕیوەتە شێخەکەی بەردەقارەمان و شۆڕەسوارەکەی دوژمن شکێنی ئاوباریک. ئەتوت جادوو گرتوومی، چرکەم لێوە نەدەهات.
هەرئەوەندەی تۆزێ هێمنیی بەیەک شادبوونەوەیان، دەواری هەڵدا و سەرنجدانی ئەملا و ئەولا کردنیان بەری بەرەڵا بوو، ئاگام لێ بوو، شێخ لەتیف، ڕووی کردە باوکی و فەرمووی: ئەوەش جەوهەری برادەرمە.
شێخیش گورج فەرمووی:
سەرکەوە کوڕم، بۆچی لەوێ وێستاوی؟
منیش بەباڵی هەموو ئەو خۆشییانەوە کە بووبوونە باری ئاوات هاتنەدیم، هەنگاوی





ئارامگەی عەبدوڵڵا جەوهەر - لەگردی ئابلاخ - سلێمانی

سەرکەوتنم هەڵهێنایەوە و بە هەموو گەرمایییەکی خۆشەویستییەوە، بە هەردوو دەست، دەستی گەورەیی ئاڵا هەڵکەری کوردستانم، وشی.

بەڵام وەک کوڕەکانی، دانەنەویمەوە ماچی بکەم.. بۆچی..؟ نازانم..! هێشتا دەستی لەناو هەردوو دەستما بوو، فەرمووی: دانیشە کوڕم و کورسییەکەی دەستە چەپی خۆی نیشاندام.. بەرامبەر بە کوڕەکانی، لەوبەرخۆیەوە. ئا لەو هەڵوێستەدا بوو، ڕووی کردە (بابە عەلی)و فەرمووی: لەگەڵ زمانی تورکییا چۆنی؟ ئەوەندەی ئینگلیزی گرانە؟ ئەویش لە وەڵاما فەرمووی: قوربان ئاسانە. هەر وشەیەکی عەرەبی یا کوردی بگری وەک خۆتان ئاگادارن، (در) و (لر)ێکی بخەرەسەر ئەبێ بە تورکی.

کەمێ بەوە پێکەنین و ئینجا فەرمووی: لەتیف، ئەم برادەرەی تۆ کوێنەرییە؟ قەراخی نییە؟ ئەویش فەرمووی: بەڵێ قوربان قەراخییە...

لە دوای چەند پرسیارێک و هەڵدانی بنەچە بە بنەچەی دانیشتوانی (مێوڵی) و (دێلێژە) کە بەربنەی (خاوێ)ن و هەموو بە قوربانی یەک (...) ناون، فەرمووی: (قادر)ی برام لەگەڵ (جەوهەر ئاغا)ی باپیرتا چۆنە؟ ئێستا نایخاتە حەوزی مزگەوتەوە؟ نەوێستایە سەر ئەوەی من دەم هەڵبێنمەوە، خۆی فەرمووی: خوا بەقوربانی (حەپسە)ی بکا، ئەگینا ئەو، ئەو پیاوە نییە، دڵی دۆستمان پێوە بێڵێ...

ئیتر یەکسەر هەڵسایە سەرپێ و فەرمووی: با بچینە لای ئەو کوڕانەی ئەودیو.

تمەس هەرچی ئەهات و خۆی ئەکرد بە ماڵا، لە پاش سڵاو داخستنێ، شارەزایانە وەک ماڵی خۆی بێ، یا سەرەی چەند جارەی بێ، لای ئەدا و ئەچوو بۆ حەوش و ناو باخەکەی ئەودیو.

بە دوایانەوە، هێشتا هەر لەبەر هەیوانەکەدا بووم و هەنگاوم بەرەو دەرگای چوونە ناو هۆڵە گەورەکە هەڵنەهێنابووەوە، چاوم تێوەبوو (شێخ) دەستی خستە سەر شانی (شێخ لەتیف) و گوێشم لێی بوو، پێی ئەوت: لەتیف، ئەم کوڕە چۆن لەگەڵتا هاتووە؟

ئەویش لە وەڵاما فەرمووی: قوربان کوڕێکی بەسزمان و لەخێزانێکی کەم دەستە. ئەمساڵ سێی ناوەندی تەواوکردووە. لە سلەیمانیش پۆلی چواری ئامادەیی نەکراوەتەوە. هێنام لێرە لە یەکێ لە قوتابخانەکانا بخوێنێ تا لەهاوڕێکانی دوانەکەوێ.

شێخ فەرمووی: لەتیف، ئەم کوڕە وەک من بزانم، دەمارێکی تیایە، جا نازانم هی شێتییە، یا هی نێری. حەزئەکەم، با قۆناغی ئامادەیی تەواوکا، ئەوسا بیرێکی تری بۆ لێ ئەکەینەوە. شێخ لەتیف لە وەڵاما فەرمووی: بەسەرچاو قوربان. ئێوە چۆن بفەرموون، منیش وەها ئەکەم.

کە لەم پرس و ڕایە بوونەوە، ڕوویان کردە ئەو دەرگاکەی تری ناو هۆڵەکە، کە بەسەر باخی ئەو دیوا ئەیڕوانی.

منیش هەر کە گەیشتمە ئاستی دەرگاکە، سەرنجم دا ناو باخەکە جمەی دێ. زۆریشیان لەو کوڕ و کاڵە ناسیاوانە بوون، پێکەوە ئەمساڵ پۆلی سێی ناوەندیمان تەواوکرد. ئەوانی تریش کەمیان هەبوو نەیانناسم. ئاگاشم لەوەبوو، هەر کە شێخ لە دەرگاکەوە دەرکەوت، هەموو بەرزەپێ لەبەری هەڵسان. لە دوای بەخێرهاتنیان و دانیشتنەوەی هەریەکە لە جێی خۆی، یەکێ لەبەردەستەکانی شێخ، دەستی کرد بە ئاو گێڕان و ڕێزە چاش بەدوایا. ئینجا ڕووی کردە هەموویان و فەرمووی:

کوڕە شیرینەکانم..

هەرچەند ئێوە ئەبینم، تین و گوڕێکی ترم تێ ئەگەڕێتەوە. لەم دەست بەسەرییەشما، ئەو خۆشییە ئەمگرێتەوە خۆی، کە چەند ساڵێک لەمەوبەر، بەدەم ئاوزەنگی لێدانەوە زەنگی ڕزگاری کوردستان ئەیدا بەگوێما و دڵی هەموو کوردێکی ئەخستە پەلە و بەری چاوی ڕۆشن ئەکردەوە. لاتان سەیر نەبێ کە ئەڵێم، بەو هەوایەی کوردستانەوە ئەژیم، ئێوەومانان جاروبار ئەم کەلاوەیەی پێ باوەشێن ئەکەن.

بەڕاستمە کە ئەڵێم، کەلاوەی دڵ و دەروونم بە ئێوەوە ئاوایە. لەبەرئەوە ئێوەش ئەگەر منتان ئەوێ، لەسەردانتانا پێم لێ مەگوێزنەوە. ئەوەندەم بۆ کردوون، ئەو بەسەرکردنەوەیە و ئەتوانم بڵێم ئەو بەزەیی پیاهاتنەوەیەش هەڵبگرم.

ڕەنگە ئێوە ئەوەندە نرخی ئەم چاوپێکەوتنانە نەزانن. بەڵام بەلای منەوە بایەخێکی هەیە و لەژێر باریشی دەرناچم.

(خولەی شێخ سەعید) ئەوەندەی پێکرابێ لەڕێی کوردا درێخی نەکردووە. تا گیانیش لەم لەشە زەبوونەیدا بمێنێ، لێی لاری نییە و سەری وا لەڕێیا..

ڕەش و ڕووتانی کورد، بە کردەوە سەلماندوویانە لەگەڵێ پیاومان دڵسۆزترن. پیاویش بوخچەیە تا نەیکەیتەوە نازانی چی تیایە.

ئەمە بەوە دامەنێن، گرێ لە دڵمایە و نهێنیتان لا

ئەدرکێنم.. وەفای ئەو ڕەش و ڕووتانەیە بێ وەفایی زۆر پیاوی بەخۆدا ڕاپەڕمووی داپۆشیوە.
ئێوەی پیاو گەلی سبەی ڕۆژی ئەم کوردە بەدبەختە، ئاگاتان لە وەفـای ئـەو ڕەش و ڕووتـانـەوە بێ. پشتکۆڵی پشت دەرگای قەڵای بەتەنگەوە بوانی کوردن.
ئێوەش کارتان تێیان ئەکەوێ و زۆربەی کاریشتان هەر بەوان زیاتر هەڵئەسوڕێ. هەربێ وەفاییەکیش لەڕووی منا سەری هەڵبڕیبێ، تەنها لە تێر و تەسەل و گوایە خوێندەوارەکانەوە بووە، نەک لەو دەس و دڵ پاکانەوە.
ئومێدم بە ئێوە زۆرە. سەرکردە بن یا کارگوزار، چاوی وەفاتان لە نەتەوەکەتانەوە بێ. ماڵی دنیا ئەوە نایەنێ، واتـان لێ بکا هەڵتان بخەڵەتێنێ. دەسەنگە و پاداشی داگیرکەران دەستان نەبڕێ، لە ڕەوشت و ڕەفتاری جوانی کوردانتان داببڕێ.
لەم ئامۆژگارییە بەنرخانەی ئەواو لە بێدەنگی گوێ گرتنی ئێمەشا، کە من لەخۆمەوە سەیر ئەکەم، کەسمان نەبوو گوێی لە ترپەی دڵی خۆی نەبێ. ئاو لەوکاتەدا، دەنگێکی نزم، کەوتە بەرگوێ. من بەش بەحاڵی خۆم نەمزانی دەنگی چی بوو. بەڵام (شێخ) دەستێکی بەباخەڵیا کرد و سەیرێکی سەعاتەکەی بەرباخەڵی کرد.
لە قەپاغ دادانـەوەی سەعاتەکەیا بوو، فەرمووی:
کوڕە شیرینەکانم،
حەزم ئەکرد زیاتر لەناوتانا بمێنمەوە. بەڵام جگە لەوەی وا بانگی نوێژی خەوتنانە، ئەترسم ئێوەشم لە ئیسراحەت کردبێ. لەبەرئەوە داوای لێ بوردنتان لێ ئەکەم و تا بەیەک گەیشتنەوەیەکی تر، بەجێتان ئەهێڵم و؟ بەخواتان ئەسپێرم...
ئاگام لێبوو، هەر کە (شێخ) هەڵسایە سەرپێ، (شێخ لەتیف) لـەم شـان و (بـابـە عـەلـی) لەو شانیەوە، بەر پێپیلکەکەیان لێگرت.
بەرلەوەی (شێخ) پێ بەرزبکاتەوە و سەرکەوێ، لەعاست خۆی وەرچەرخایەوە و فەرمووی: کوڕەکانم، باوەڕتان پێ ئەکرێ. چاوتان پێ هەڵدێ و نیازتان پێ ئەسپێرێ. ئێوە لەو شێربەچانەن و لەو ناکەس بەچانە نین، لە ڕۆژی خۆیا نەبێ، پریاسکەی دڵتان لای کەس بکەنەوە، متمانەی تەواویان پێ نەکەن. بۆیە منیش بەخۆم و بەئێوەشا ڕائەپەڕمووم گرێی دڵتان لا بکەمەوە.
نە دنیا لەسەر یەک سەمت تاسەر ئەڕوا و نەمنیش هـەروا دەسـت بەستراو ئەبم. تا دەسـت و پێش ئەکرێتەوە، ئۆباڵم بە ئەستۆتان، ئەگەر پێم لێ ببڕن و بۆن و بەرامەی ئەو کەژ و کێوانەی کوردستانم لێ بگرنەوە..
هەر ئەوەندە ئەڵێم و ئێوەش ڕۆڵـەی ئەو دۆڵ و دەرانـەن و تێش ئەگەن ئەڵێم چی. ئیتر خواتان لەگەڵ...
لەدوای یەک دوو ڕۆژ مانەوە، هەروا بۆ بیرخستنەوە، وەک ئاگام لە گفتوگۆکەیان نەبێ لەگەڵ باوکیان بە (شێخ لەتیف)م وت:
کاکە شێخ، منتان بۆچی هێنا و ئێستا نیازتان چۆنە؟
- ببوورە، ئەبوایە زووتر پێم بووتیتایە.
باوکم ئەفەرمووێ، با پێنجی ئامادەیی تەواوبکا، ئەوسا بیرێکی تری بۆ لێ ئەکەینەوە.
جا کە ڕۆیشتینەوە، کارێک ئەکەم لە قوتابخانەی ئامادەیی کـەرکـووک وەربگـیـرێ. تـۆش بەخێرێ تەواوی بکە. ڕەنجتان خوا یاربێ بەفیڕۆ ناڕوات.
کە گـەڕامـەوە بۆ سلەیمانی، بـەرلـەوەی خـۆم بۆ کەرکووک بپێچمەوە، هەموو کەین و بەینێکم بۆ دایکم گێڕایەوە.
ئەویش فەرمووی: خوا یاربێ، ئەم کارەتان بەخێر ئەگەڕێ. باوکیشت کەهاتەوە بۆی ئەگێڕمەوە و بە هەرچی چۆنێک بێ، لە مشوور خواردن دواناکەوین.
لەو میانەدا، بۆ ئەمەی خەمی دەستکورتی و لەدەم گرتنەوە، نەیەتە کایەوە و زیاتر برینی ناسۆر نەکەوێتەوە و منیش دڵ شکست نەکا، قسەی بەسەر قسەدا هێنا و فەرمووی: ئەزانی شێخی گەورە بۆچی فەرموویەتی دەمارێکت تیایە؟ چونکە تۆش وەک کوڕەکانی و هەموو یەکێکی تر کە ئەچنە خزمەتی، دەستتان ماچ نەکردووە.. جا پێم ناڵێی تۆ بۆچی دەستتان ماچ نەکرد؟
- تا ئێستا بەدڵما نەهاتووە جگە لە باوکم و باپیر، یا خاڵ و مام، دەستی کەسی تر ماچ بکەم. ئەو جـارەی لێ دەرچـێ کە لە(مێولی) بەخێرهاتنی مامۆستا (ئەحمەد بەهجەت)م کرد و دەستیشم ماچ کرد...
- ئاخر ڕۆڵە، ئەویش مەلیکی کوردستانە و تاجی سەرمانە.. چۆن ئەبێ دەستی ماچ نەکەی؟
- زۆرجار لە خۆتانم بیستووە، کورد سەربەرزە، بۆ ئاڵاکەی خۆی نەبێ، نابێ سەردابنەوێنێ و لەڕووی کەسا بچەمێتەوە..! لەوێش، نە لەدیوی دەرەوە، نە لەدیوی ناوەوە ئاڵای کوردم بەدی نەکرد، سەریان بۆ دانەوێنم..!

عەبدوڵڵا جەوهەر



– ڕۆڵە، ئەو خۆی ئاڵای کوردستانە.. بەڵام ئەمڕۆ پێچراوەتەوە.
– دایە گیان، بەدەمی من زیادە، لەڕووتانا دەنگ بەرزبکەمەوە. بەڵام ئایا ئاڵا بۆ پێچانەوەیە یا بۆ هەڵکردن و شەکانەوەیە..؟ من هێشتا ئاڵای کوردم نەدیوە چ ڕەنگە..؟! ئەبێ تا کەی هەر دڵمان بەخۆمان بسووتێ..؟!
– کوڕم، شەڕە و دۆڕانوومانە. مەلیکەکەشمان دەست بەسەرەو دوورخراوەیە.
– کەوا بوو، ڕێزی مەلیکی کوردستان بەدەست ماچ کردن ناگیرێ، ئەگەر ئێمە ڕاست ئەکەین، ئەومان خۆش ئەوێ، ئەبێ یەکێتی تێکۆشانمان بکەین بە سەنگی مەحەک بۆ ڕێزی خۆی و ئاڵاکەی دەستی..!

— ٩ —

دایەگیان، لەبیرمە، دوا بەدوای سەردانەکەی باوکم و ئەو قسانەی لەبارەی منەوە بۆی گێڕابوونەوە، لە یەکەم نامەی بەسەرکردنەوەتانا، ئیتر بەهەرکەسێکتان نووسیبوو، نووسیبووتان:
کوڕی خۆم، خەوم پێتەوە دیوە، لە سەغڵەتییای.. نامەردت نەکەن، دەس لە دەسی ڕمووزەنی نامۆیی بەردە. لە جێیەکی دووریش بویتایە هەر نەیسە، ئەمووت مناڵکارە و دنیا نەدیدە، بۆیە سەری لێ هاتۆتەوە یەک.
خۆ کەرکووک لەبنی دنیا نییە. چاوبڕکێی پیرەمەگروون و باباگوڕگوڕ، دوو هەنگاوە ڕێی ئەمڕۆیە...
لەو دانیشتنەتانا کە (یونس ڕەئووف)ی کۆیی دڵی باوکتی تیا داوەتەوە، خستوویەتییە خۆشییەکی ئەوتۆوە، شانازی بەوەوەبکا کە کوڕی وەک ئەو و (نوری شاوەیس) هاوڕێتن و لەیەک پۆل و یەک قوتابخانەدان و سەرەڕای ئەوەش، وردە باسی ناوخۆتان، سەری برایەتی پێ ناون بەیەکەوە.. ئەی ئەو هاوڕێیانەت بۆچی وەک تۆ شانیان لە نامۆیی هەڵنەکێشاوە؟ خۆ ئەوانیش یەکەمساڵیانە هاتوونەتە کەرکووک و ئەخوێنن.؟
وەک ئەوان، بەشاری خۆیانی ئەزانن، کە لە ڕاستیشا شاری هەموو کوردێکە، تۆ بۆ سەرت لەخۆت تێکداوە و بیر لە ڕەشەبای سلێمانی ئەکەیتەوە؟ ئێرە و ئەوێ و هەموو شار و دێیەکی خاکەکەمان، وەک یەک باوەش بۆ منداڵانی کورد ئەکەنەوە...
دە ئێوەش، نە ئەوان دەستخەڕۆ بکەن و نەخۆشتان ڕەنجەڕۆ..! ئەوەش باش بزانە، ئەگەر هەموو کورد، خۆی لە باباگوڕگوڕ بتۆرێنێ، ئەو لە کوردستان ناتۆرێ و چراووک بە دەستی خێر و خۆشیی کوردانە، با ئەمڕۆش دییزە بەدەرخۆنەی پێ کرابێ...
کوڕەکەم،
ئەم جیهانەی تیایا ئەژین، کتێبێکی یەجگار گەورەیە. هەر ڕۆژە، نەک منداڵانی وەک تۆ و هاوڕێکانت.. هەرچی لەئێوەش گەورەترە، تا ئەگاتە مامۆستاکانیشتان و لەوانیش کامڵتر و کارامە تریش، لاپەڕەیەک یا چەند دێڕێک لە




**ساڵی ١٩٩٩ خانەی زاموا بۆ پاراستنی دەستنووس چەند دانەیەکی کەمیان لە (دایەگیان) چاپکرد**

لاپەڕەکانی ئەخوێننەوە... هەشتانە، بۆ دواڕۆژی باش ئێمە و ئێوەش، چەند دێڕێکی تیا ئەنووسنەوە، یا ئەبنە سەرچاوەی چەند دێڕ لەسەر نووسینێک... تۆش ئەم چەند ڕۆژەی بۆت ڕێکەوتووە، چەند لاپەڕەیەکی تیا هەڵدەرەوە و کەمێ خۆتی پێوە ماندوو بکە. با لەدواڕۆژا ئەگەر توانیت چەند دێڕێکی تیا بخەیتە سەر پەراوێزی یەکێ لە لاپەڕەکانی..

ئەوەش بزانە، ئەمڕۆ و سبەینێ هەموو سەردەمێک بەستراوە بە ڕۆژانی ڕابردووی هەموو نەتەوەیەکەوە...

کوڕە شیرینەکەم،

هونەر ئەوە نییە، پشت بەتێری ببەستی ئینجا هەنگاو بنێی. هونەر ئەوەیە بەسکێ تێر و بە دوو سک برسێتییەوە، چاو ببڕیتە هەورازی ئومێد و بەدەم پەلاماردانەوە بەهاوشانی و قۆڵ لە قۆڵی هاوڕێکانتا، ڕێی دواڕۆژی خۆتان و هۆزەکەتان تەخت و جێی خۆشگوزەرانی یەک بەیەک لە ئەندامانی نەتەوەکەتان ڕەنگ بڕێژن و هەوڵ بدەن تەلاری سەرفرازییان بۆ بەرزبکەنەوە...

هونەر ئەوە نییە، هەر سەرەڕۆیانە مل بنێیت و گوایە خۆت بە ئازا بزانی، ئاوڕ لە هیچ نەدەیتەوە... هونەر ئەوەیە، کە ئاوڕت لە کردار و ڕەفتاری خۆت دایەوە ڕوو زەرد نەبی...

چاو لەوانە مەکە خۆیان کۆستەن و باسی ڕیشی تۆپی باوو باپیریان ئەکەن...

لەمڕۆ هەلت باشتر دەست ناکەوێ، ڕەنگی دڵسۆزیتی تیا بڕێژی و بناغەی بدەیتەوە..

ڕۆژێکی ئیش کردنیش، لە عومرێکی دوور و درێژی تەمەڵیی و خەیاڵ پڵاوی ڕووسوورترە...

کوڕی خۆم،

ئەو دینار و نیوەی، مانگانە، دڵسۆزێکی وەک (شێخ لەتیف) بۆت ئەنێرێ، مەیکە بە تیرێک و هەموو مانگێ بیگریتە پەڕەی جەرگت. گەورە و بچووک، دەست کورت و دەست ڕۆیشتوو، هەر بووەو هەر ئەشبێ...

ئەوان ئەمڕۆ گەورەیەکی دڵسۆزن، خوا دەس بە عومریان بگرێ و بەرخوردار بن... تۆش سبەینێ ناڵێم بەقەد ئەوان، ئەگەر زۆر لەوان کەمتریش دەستت ڕۆیی، بە قەدەر توانا دەستت بەماڵی دنیاوە

نەلەرزێ و درێخی لە هاوڕێکانت مەکە و ئاگات لە دەورو پشتەوە بێ...

ڕووی قەرز لە کەس نەنراوە، بڵێی ئەبێتە سەر دەق شکاندن بۆ دەست پان کردنەوە لەم و لەو.

چاکەش بەدەسەنگە مەخوێنەرەوە، با سبەینێ ئەگەر تۆش چاکەیەکت لەدەست هات، ڕێ بەناکەسبەچە نەدرێ، چرنووک لە دەروون بگرێ و دڵی دۆست و چاکە لەدەست هاتوو، کرێ بکاو دەروونی چاکە پێ کراویش بڕووشێنێ.. هەموومان چاومان لە چاکە و


اغنام تذکرەسی
قیمتی بر غروشدر

| دفتر نومروسی | عدد | تذکره نومروسی |
| --- | --- | --- |

قیون
کچی ٨٠
نفتك کچیسی
٨٠

دۆکیۆمێنتێکی عوسمانی لەوەرگرتنی باج لە باپیری عەبدوڵڵا جەوهەر



یارمەتی یەکترەوەیە. ئەو پارووەشی لە دەمی پیاو دابکەوێ، بۆ کۆشی دۆست و هاودەنگ باشە..!
کوڕی خۆم،
دڵت هیچ نەکاو بەسە ئیتر بەزەییت بەخۆتا نەیەتەوە... چ تۆ و چ ئێمە، ژیانەکەمان هەر ژێر دەستەییە و نانەسکیی.
ئەزانم، لەو دینار و نیوەی بۆت ئەنێرن، مانگی دینارێکی ئەدەی بەکرێی ژوورێکی ئوتێل...
ئەمێنێتەوە سەر نیو دینار بۆ مانگێکی ڕەبەقت.
دڵنیابە ئەو نیو دینارەی بەتۆ ئەبڕێ، ئەگەر پەڕۆیە لە ئێمە دادڕی، هێشتا لەچاو مانگانە سێ دینار پۆلیسییەکەی باوکت بە کەمتر نازانرێ، کە گوزەرانی خێزانێکی چەند سەرکەسیی جگە لە کەلوپەل و خۆراکی ماڵ و منداڵ، بەڕێ کردنی میوان و وردە خەرجی و کرێی خانووشی وا بەسەرەوە..!
کوڕم،
سەرێکت نەبێ و هەزار سەودا. خۆشەویستی ژیان و چاوبڕینە دواڕۆژ، بەرگە گرتن و دان بەخۆدا گرتن هەڵئەگرێ و زیاتریش...
خۆشویستنی ئەمڕۆی (دەرس و دەورت) سەرچاوەی گشت بانگەوازێک و بەدەنگەوە چوونێکی خۆت و گەل و نیشتمانەکەتە... لەبار و بارگەی ئەم کاروانەشتا زرنگ و زیتانە وریابە، هەر گوێت لە دەنگی بەرز نەبێ و تیژ بەسەریا تێپەڕی... لەسەرخۆ گوێ بۆ گەلێ دەنگی نزمیش ڕاگرە و پیا بچۆرەوە.
کوڕی خۆم،
ئەوەندە بەخۆتا هەڵمەکاڵێرەوە، منیش تووشی دڵەڕاوکێ بکەی..
بەڵێ، لەگەڵتام کە ڕەخنە لەخۆگرتن و بەخۆدا هەڵکاڵینەوە، لەش ساغی بیرکردنەوەیە... بەڵام زۆر وتنەوەی لە کەڵک خستنی گیانە و کەمەنگە بۆ خۆ بەدەسەوەدان...
مادام تۆ و مناڵانی ئەم کوردە سەرسەختە، خۆشبەختانە لە سەربەستی و سەرفرازی ئەگەڕێن و کەوتوونەتە سەر ڕێی خۆتان، گەیشتنتان بە ئامانج، تابێ لێتان نزیک ئەبێتەوە.. پەلە پەل کردنەکەی ئێوەش کە سەرنجی باوکتی ڕاکێشاوە و مەترسی ئەوەی لێ نیشتووە بە قەڵبەیەکتانا بدا، وەک من بزانم، لەو سەرچاوەیەوە بنەوانی هەڵگیراوە کە تا تروسکایی ئومێدی بەئامانج گەیشتن دوورتر بێ و ڕێگای زوو پێ گەیشتنی سەخت تر بێ، گیانی بە تەمابوون بەجۆشتر و دەنگی تێوەگلان بەخرۆشتر ئەبێ... ئێوەش، لەگەڵ کاروانچی کارامەدا، کاروانتان ڕێک بخەن، چاوتان نەترسێ و دڵتان نەلەرزێ. هەر لەکنەی خۆتانا بن. بەڵام ئاگاتان لە بەرپێی خۆتانەوە بێ و بزانن چۆن هەنگاو ئەنێن و لەکوێ قۆناغ ئەخەن و لەکوێ ئەبێ قۆناغ نەخەن. چونکە وەک سەری دنیا بەپووش نەگیراوە، دوژمن و دز و جەردە ڕێوییەکانی بەبێ مریشک هەڵناکەن..!.

بەڵێ، ئەم ئامۆژگارییە بەنرخانەتانم لەیادە و هەرگیز لەبیرم ناچنەوە و هۆش ڕوونکەرەوەی بە پیرەوە چوونی سەختی ژیانمن.
ئەم پەند و ئامۆژگارییانەتان نەک هەر وەک تاقتاقکەرە بەشەو، بەڕۆژیش هەر لەشەبەقەوە تا ڕۆژ بەڕوو زەردی خۆی لە لووتکەی هەرە بەرزی کێوەکانی کوردستان ئەشارێتەوە، کۆتر ئاسا گمەگمە و پێیەوە ئەناڵێنم و پیا ئەچمەوە، لێی نابمەوە و تێری لێ ناخۆمەوە..!

-١٠-

ئەو خەوە یەجگار خۆشەم لەبیرە کە بەگۆزەی تازە کوورەی سەر شان و لوولێنەی دەستەوە لە کانی ژنانی گەڕەکی سەر حەوز، ئەگەڕایتەوە. بەڵێ، ئا لەو گەڕانەوەیەتانا بوو، هەر کەمنتان لەسەر سیلەی ماڵی (حسە شێت)ی ئەوبەر ماڵی خۆمان، بەدی کرد وا بەدیار زەلامێکی پەڕ لەسەری چەتەوڵەوە، وەستاوم چاوم بڕیوەتە ئەسپەشێی ئەو دەستی و، تفەنگەکەی ئەم دەستی...
لەبەر دەرگاکەی خۆمان، لوولێنەکەتان دانا و بە دەست ڕاوەشاندنێ بانگتان کردم. هەر بەو دەستەش قاپیی دەرەوەتان کردەوە و منیش بەدواتانا خۆم کرد بەماڵا...
گورج، کە گۆزە و لوولێنەکەتان لە ژێر هەرزاڵەی بن دارتووی ناو حەوشەکەدا دانا، بەزەردەخەنەیەکی باوەش بۆ گرتنەوەوە، فەرمووتان:
ئەوە سەیری چیت ئەکرد..؟
- سەیری ئەسپ و تفەنگی دەستی ئەو کابرایەم ئەکرد..
- حەزت ئەکرد تفەنگێکت ببوایە؟
- نەک هەر تفەنگ، حەزم ئەکرد دەمانچە و خەنجەرێکیشم ببوایە..
- بۆ چیتن؟
- بۆ ئەمەی زۆردار پێمان نەوێرێ و دەستیشی

بۆ هێنانین، وەک چۆن باوکم ئەیگێڕێتەوە، هەمەوەندەکان سەربازی عوسمانلییان تەمێ ئەکرد، ئەوجا بەرەڵایان ئەکردن، ئێمەش ئاوەها تەمێیان بکەین و گووی خۆیان دەرخوارد بدەین..

– باشە، تۆ چووی بۆلای ئەو کابرایە، یا ئەو بانگی کردی..؟

– حیلە حیل و چەپۆکانی ئەسپەکەی بانگی کردم..

– لێی نەترسای؟

– ئەی ئەو ڕۆژە باوکم پێی نەوتم، ترسی کەست لە دڵا نەبێ و چاوت لە هیچ نەترسێ..؟

– کام ڕۆژ..؟

– ئەو ڕۆژە نەبوو، ناردمی بۆ باخەکەی خوار گەڕەکی یۆنس، بۆ لای کاک حەمە ساڵحی جەواهیری ئامۆزا، نوخشەی بەڕووله خەیارتان بۆ بێنمەوە..؟

– هەر ئەوەندە؟ ئیتر هیچی تری پێ نەوتی..؟

– لەبیرمە کە ڕێی باخەکەی بۆ دەستنیشان کردم، ئینجا فەرمووی: کوڕم کەوتنە ڕێ و شارەزایی ڕێگا، چەند پێویستە، ئەوەندەش پێویستە هەنگاو لەسەر خۆبنێیت و چاوت لەبەردەمی خۆت و ئاگاشت لەملا و لەولای خۆتەوە بێ. مار و مێروو، سەگی هار و دڕندەی چەم و چوغورد لەپڕ سەر هەڵئەدەن و ڕەنگە پەلاماریش بدەن، بەڵام تۆ نابێ لە هیچیان بترسی. کورد نەک لە هیچ دڕندەیەک ناسڵەمێتەوە، واش بەدەنگیەوە ئەچێ، پیرە دەعبا لەبەر دەمیا خۆی پێ نەگیرێ و هەڵبێ..!

– باشە، وەک لەو کابرایە نەترسای، وێرات، چاو ببڕیتە چاوی؟

چاوی مۆن و خوێنی تاڵ بوو. سوورفلێکی بەدڕەزا، ئەتووت لە ترش و خوێی تاڵانی و ڕۆن و پیازی کەڵەگاییا سوور کراوەتەوە..!

– ئەی چۆن زەلامێکت هاتە بەرچاو..؟

– نە بەدڵ وەک باوکم بوو، نە بە زمان. نە بە جل لە خاڵوان و پیاوگەلی ئاواییەکەی خۆمان ئەچوو، نە بەگیان..!

– لەوە ئەچێ، ڕقت لێ هەڵگرتبێ..؟

– ئەی خۆتان فێرتان نەکردووم، ئەوی پێی زۆرداریی نایە کوردستانەوە، هەر هیچم لەدەست نەیە، ئەبێ گەزارەی لێ بکێشم و بەو ئەندازەیەش ڕقم لێی بێ، وەک چۆن ڕقم لە بەراز ئەبێتەوە؟

– بەچییا ئەزانی زۆردارە؟

– هێشتا لەسەر کانی نەهاتبوویتەوە، لەبەردەرگای خۆمان، خەریکی بارە کەوەکانی خۆم بووم، باڵی ئەو کوللە باڵ سوورانەم بۆ ئەکردن کە بەیانی زوو، لەم پەرێزەی بەر ماڵی خۆمانا بۆم گرتبوون. لەوەدا بووم، بۆیان فرێدەمە قەفەزەکەیانەوە، وەک شمڵی شەڕ هات و بە مرەمرێک قەفەزەکەی لەبەر دەست هەڵگرتم و لەدوای سەیرکردنێکیان، شووڵی دەرگای قەفەزەکەی هەڵکێشا و هەردووکیان دەرپەڕینە دەرەوە. هەتا یەکێکیانم گرتەوە، ئەویتریان پشیلە دەستەمۆکەی خۆمان، پەلاماری داو فڕاندی. نەمزانی خۆی کرد بەکام بنە تووترکا... ئەویش وەک گەماڵەکەی بەر ماڵی مەلا حەکیم، چۆن لمۆز ئەخاتە سەر هەردوو چەپۆکی و زرتەی چاوی دێ، چووە ئەولاوە و دەستی جڵەوەکەی لەژێر چەنەیا کردە کۆڵەکە و چاوی نامەردی بڕییە من. وەک گاڵتەم پێ بکا، دەستی تفەنگەکەی بۆ ناو تووترکەکان ڕائەکێشا و هەروەک ڕۆنی سەگ لە لەشی بدەی، زەردەخەنەیەکی تا بلێی پیس و ناڕەزاش لای لێوی ئەگرت..

هەر لەدوای ئەوەش، (مامە مارف) لێرەوە هات و تێپەڕی. ئاگام لێبوو، ئاوڕی نەدایەوە، دیار بوو ئەیناسی چ ماڵێکە... بەڵام هەر کە ئەو پشتی هەڵکرد، ئەم لێرەوە، تفی لێ ئەکرد. لەوە ئەچوو لە بیانوو بگەڕێ و هەڕەشە بکا، ئەیبۆڵان و بەچاوێکی مۆنەوە لێی مۆڕ ئەبووەوە..!

– حەز ئەکەی پێت بڵێم ئەوە کێیە..؟

– زۆریش...

– کوڕم، خەمی بارەکەوەکەت لە دڵ دەرکە. ئەزانم چەند دڵت پێی خۆش بوو، بەڵام بە خاڵە (مەجید)ت ئەڵێم، لەبری بارێک چەند خاڵ و مییل ڕێژراوێکیشت لەم ڕۆژانەدا بۆ بگرێ...

ئەمێنێتەوە سەر ئەو کابرایە، ئەوە ئاسورییە و تولە و تانجی ئینگلیزە زۆردارە بەدفەساڵەکانە، هێناونی لەم ناوەدا، ڕاوی کوردیان پێ بکەن... دەسەڵاتیش نییە.. دیواری ئەم کوردە ئەوەندە نزمە، هەموو خوێڕییەک پیا هەڵئەگەڕێ و بە سەریا باز بازێن ئەکا..! ئەو گەماڵ باوکەش، ڕاست ئەکەی زۆردارە. چونکە ئەگەر وەک ئاغاکەی، زۆرداریی دەستی نەبڕیایە، پەرژینی ئێمەی نەدەشکاند و نەئەکەوتە مەرزی باخ و بێستانی کوردەوە..!

ئەوێک کە زمانمان نەزانێ و خواش ئەزانێ، خەڵکی کوێیە، لەوە زیاتر زۆرداریی ڕابەری بێ، ئەبێ بە چ نیازێکی گڵاوی تر خۆی پڕ چەک کردبێ و هێنابێتیانە سەرمان..؟.





# له پایتەختەکەی ئەمیر (عەبدوڵڵای هاشمی) زادەدا

عەبدوڵڵا جەوهەر

١٩٦٠



## گەڕان بە دوای خۆما

(١)

لەو ڕۆژانـەدا کە چاوی هەرزەکاریم، بڕیبووە گوڵاڵەی خۆشەویستی و گڕوتاسەی گەرمی لاوی، شیلەی شیرینی ژیـان، پەڵپ و بەهانەی حەز، هەڵپەی زۆری ئـارەزوو، بەر لێوی هەڵاڵەی عومری گرتبووم، بانگەوازی خۆشی، شمشاڵی ژێر ڕەشماڵی شەنگ و شۆخی، پەردەی گوێی ئەلەرانمەوە، ساز و سەنتووری بێباکی لە ناخی دەروونا دەنگی ئەدایەوە.

بەسواری بایی بوونەوە، ڕاستی و جوانیم لە چەوت و چەوێڵی ناشیرینی پێ جیا نەئەکرایەوە، ئا لەو تەمەنەدا، لە شارە خنجیلانەکەی (عەمان)دا... لە سایەی ئاڵا شەکاوەکەی ئەمیر عەبدوڵڵای هاشمیدا، لە سایەی نازوبازی تەخت و تاجە لاعییەکەیدا.. هەر لایەکم ڕووی کردبووە لایەک و لە پشت پەردەی کورسی و مێزەوە، تەرپۆشانە ڕۆژگارم ڕاو دەنا، تیکەم ئەگلان و گوڕەی داوێنم ئەهات..!

(٢)

لە پووشی پەڕی ئەو سەردەمانەی دڵ تەڕییمدا بوو، چاوم کردەوە وا لە کەڕەنای تاریکییەوە فوو لە چلچرای ڕووناکی ئەکرێ، گەنجێتی و خوێن گەرمی، لە کارمامزەی تەرە و دڵ خورپە تێگەڕاو، خێراتر لە پشت هەڵکردندایە.

کشتەکی بایی بوون و بێباکی لە خاوبوونەوە دایە، هۆش و گۆش لە خۆدزینەوەی پەشیمانیدایە، خۆشی و جوانی چوون بە گژ تەمەنا و دەستەویەخە وەستاون، کۆڵەکەکانی ژێر نێرگەی قرچە قرچ تێکەوتووی ئومێد، لە کشانەوەدان، ئاین و ئۆینی خەڵک و خوا پەردەی لەسەر لاچووە، ناشیرینی ڕواڵەت ئەجوێتەوە.

تەلیسمی کورسی و وەزیفە لە شکانێکی تەواو شکاندایە، چاکە بە خراپە سواغ ئەدرێ و بێڕێزی لە قوڕە ڕەشی گەمە پێکردن و لاقرتێ گیراوە.

کاربەدەستانی دین و دنیاش، بە هەموو پاشەڵ پیسییەکیانەوە، لە کنددان دەمـاری پیاوەتییم با بـدەن، خەریکن چاوی ڕاستاییم بێننە گل، قێزکردنەوەی خۆشم، دەستی دابووە نەڕاندن بەسەرما، ئەوسا کەوتمە پەلەقاژێی خۆدزینەوە و خۆدزینەوە، لە هەرچی جاران دڵم پێ خۆش ئەکرد.

(٣)

هێشتا هەر لە چاوڕشتنی بەر ئاوێنەی قوتابخانەکانا بووم، لە گەلێ ڕێکەوتا ئەمبیستەوە، خوێنی پاک گوایە بە دەمارەکانما هاتوچۆ ناکا، ئەوسا بەلامەوە زۆر سەیر بوو، خوێنی پاک یەعنی چی؟

بـەڵام، ئـەمـڕۆ کـە هـەمـان بـالـۆرە دەبیستمەوە، سەرسوڕمان زیاتر چەواشەم ئەکا.

هێشتا هەر قوتابی شیرەخۆرەی دایکی زانستی بووم، لە دانیشگاکەی (بەیروت)دا، جاروبار ئەچووم بەسەر مشتومڕی سەر هەڵ کەندنا.. کەچی لێیان ئەگۆڕیم بە ئاشی لە ئاو کەوتوو، بەڵام ئەمڕۆ زۆر بێشەرمانەتر، شووڵیان لێ هەڵکێشاوە.

ئەوسا، دەم و دووی ڕۆژانە، گەلێ جار تێکەڵاو بە تەنگاوی چرپە چرپ و چاو لە یەک داگرتن و لچ لێ هەڵقورتاندن ئەبوو، بەڵام ئەمڕۆ، یەکجار بێ ئابڕوانەتر، لە بیستنی ئەم شەکر شکاندن و سەرنجدانەدا، دوێنێ کە هەڵسڵەمانەوەیەک و موچورک بە لەشدا هاتبێت، بوو.

ئەمڕۆ، دنیام لەبەر چاو تاریک ئەبێ، کەرامەتیش کە شێلرا، هەموو شت لەبەر چاو ئەبێزرێ و سەد خۆزگە بە مردن ئەخوازرێ.

بـەڵام، پیاو نەک هەر نایەوێ، ترسنۆکانە بمرێت، خوێن لەبەری لەپڕدا بانگی ئەکا، بۆ سەندنەوەی ئەو کەرامەتەی بە بێ ئەو ژیانی بۆ نییە، ئەم کردەوە ناڕەوا و ڕەفتارە ناشیرینانە، ئەمڕۆ زیاتر لە ڕۆژانی ڕابوردوو، ملم بائەدات، بۆ خۆ کوتانە هەرە قووڵایی گۆمی گومان لێ کردنەوە، لە هەرچی هەیە و نییە، گومان کردن لە خۆم، لە ناو و شۆرەتم، لە ڕەگەز و سروشت و نـەژادم، لەگەل و نیشتمانم، واتـە، گومان وەک زمانزانێک لێم هاتبووە سەر کلک و داری سەرپشکی دابووە دەستم.. من کێم؟ ئەو شۆرەتەم لە کێوە بۆ ماوەتەوە؟

لە کێوە هەڵقوڵاوە و سەری هەڵداوە؟ لە چ ڕەگەزێکم؟ لەمانەم ئەمڕۆ لەگەڵیانام؟ سەر بە کام نەتەوەم؟ نیشتمانی باو و باپیرم لە کوێیە؟ ئەم پرسیارانە و زۆری تریش، گومانی خەستتر ئەکردەوە، ئارەزووی زیاتر ئەخستەوە سەر گەڕان بە دوای تینوێتی شکانا.

(٤)

لە دەریای بێ پەیی تاریک و نووتەکی، نەشارەزایی و لێکدانەوەی تازە یەخە پێ گرتووما، مەلە کردنم وەک ناچاریی بوو، بە پێویستیشم ئەزانی.

چاو کزێتی بیرکردنەوە، تەواو زەیفی لێ سەندبووم، دەستی ئـەم شەپۆلی گومان و سـەر لێشێواویی، ئەیدامەوە دەست شەپۆلێکی تر، گەلێ دڵڕەقتر و پشت شکێنتر.

بە دەست دەردی تێ نەگەیشتنمەوە، بە داخی دەستە و وەستانیمەوە، لە جۆماڵی بنەوان هەڵگرتنا، دابوومە باریک و بنێسیەک، لە جاران دەم و چاو قوپاوترم لێ دەرچووبوو.

وەک چاوە قووڵێم گرتبێ، بوو بوومە دەعەجانێیەک، هەر مەپرسەی ناو بـوو، خوێش چ جای دەروێـش، دابوومیانە بەر کلکان و خێسە لێ کێشان، کەڵەمەی دۆست و دوژمن لە یەک جیانەکردنەوە، سەری لێ هێنابوومە یەک.

ئەگەر جار و بارێک تاس بردنەوە، بە دەم و زمانی ورە بەردانەوە، ڕووی دەمی تێ بکردمایە و بپرسیایە' ئەم شەڕە چەلەحانێ و کێشمەکێشمەت لە چییە؟ ئومێد، لێی ئەهاتە زمان' شیرینی دۆزینەوەی شەقامەڕێی ڕزگـار بـوون، لە مرۆڤ خۆی بە هێزترە و لە ژیان باڵادەستترە.

لەبەر ئەوە وەڕس بوون و وچان دان چ قوورەت بوو خۆیان لەقەرم بـدەن، چونکە کوولەکەی گیان لە گێژاوێکا خستبوومیە سوڕانەوە بە دوای گەوهەرێکی لێ ون بووی ئەوەندە بە نرخدا، دەماخی گیان لەبەریشم تەقەی سەری ئەهات.

بە سەرومڕی لە باوەشی پەستیدا بووم، قۆڵم لە قۆڵی گۆشەگیریی دۆستم بەرنەئەدا، بەڵام گۆشەگیری خاوەن پەیامێکی لێپرسراو، نەک وەک هی سۆفییەکی بێکارە، کە خۆی لە هەموو سەرئێشەیەکی شاردبێتەوە.

هەر بێدەنگییەک دەواری هەڵبدایە، خۆم لەژێریدا ئەدۆزیەوە، وەک بمەوێ کڵافە دەزوویەکی ئاڵۆزکاوی نادیار، تاو تاو کەم و سەری تاڵی هەڵکراوی یەکاڵا بکەمەوە.

(٥)

لە دوای چەندان چەرخە کردن، بەم مەیدانی پشکنین و ئەو مەیدانی لێکۆڵینەوەدا، کە سەرچاوە نەما، دەمی بیر کردنەوەمی لێ تەڕ نەکەم، شەوێکیان، لە ناکاو، بەدەم داڵغەی دۆزینەوەی سەری پیرە کڵافەی ئـاڵـۆزکـاوەوە، چـاوم چـووبـووە خـەو و نەچووبوو، دەنگێکی یەگجار نزم و نەرمی نهێنی، بە ئەسپایی تەلی گیانی ڕاتەکان، بە دڵ و دەروونیا چرپان' لە



خێڵ و هۆز ئاوارە بووەکە، من دەم و زمانی برینەکانی، لەش و لاری جوانیی جوانەمەرگ و پاڵەوانانی باو و باپیرانتم، ڕۆژێک زووتر بکەوەرە خۆت و بگەڕێرەوە بۆ نیشتمان، نیشتمانە جوانە بە گوڵ و گوڵزار ئارایشت دراوەکەی لەمەڕ خۆت، دایکی نیشتمان هەموو لایەک بانگ ئەکاتەوە، باوەشی گرتووەتەوە بۆ کۆرپەکانی، دڵی کردووەتەوە بۆ خۆشەویستەکانی.

گەشکە هارانە، لە خۆمەوە، بە دەنگێکی بەرز، کردمە گاڵەی خۆدۆزینەوە، ئەرێ وەڵا دۆزیمەوە، خەڵکی ئەم وڵاتە نیم! خوێنی خەڵکی ئەم وڵاتەش بە دەمارەکانمدا هاتوچۆ ناکا.

فرمێسکی خۆشی، بەریانی هەردوو چاوی گرتبووم، کە دڵی پڕم لە گریانی بێدەنگیا هاواری لێ هەڵسا:
' لانە لێ داگیر کراو خۆم، لانە لێ تێکدراو خۆم، لە لانە دەرکراو خۆم!

(٦)

لە ناوجەرگەی تاریکیی خەم خواردنەوەدا، بەدەم موچورکی خۆ نەگرتنەوە، لەگەڵ هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی ڕۆژانی ڕابوردووا، لەگەڵ کڵپەسەندنی حەسرەت و هاواری دەروونا، ئارەزوو کوێر کردنەوە، کەوتە دەماخ سووتان.

زمانی لاڵی بە یایی و پەشیمانی کرایەوە، دەنگی فریاکەوتن، گەیشتە دەم و لێوی بە خۆدا هەڵکاڵینەوە. لەپە و ڕوو، شەرمەزاری کەوتە دەست پان کردنەوە و پاڕانەوە ' باو و باپیرانی گیان پاک لە کوێن؟!

نازانم لە کوێن، بەڵام باش ئەزانم، کە گوێتان لە زایەڵە و داخ خواردنی پەشیمانبوونەوەیە، تازەش زانیومە، ئاوەکییم و تەرە کراوم! بەڵام لە کوێوە هاتووم؟ کوێنگەریم؟ نازانم! ئەوەندە هەیە دەستی خۆمی تیا نەبووە و هەڵبژاردەی خۆم نەبووە، بۆم ماوەتەوە، لە هەر کوێ هەن، سەر بەهەر خاکێکن، دڵنیام خزمەتکاریی پیشەی ئێوە نەبووە.

بەڵام، وەچە بوودەڵ بێ! ئازایی و وریای ئێوە چ دادێکیان ئەدا؟ وەجاخ کوێر بێ، دەسەڵاتی ئێوە فریای کێ بکەوێ؟

تووتن خۆی پارە ئەکا، وەچەی فرێش نەدرێ، با بەبارستایش قەبە بێ، قەمەرەیەک ناهێنێ!

وەچەی ئێوەش، بە کۆیلەیی قنیاتی کردبێت، زمانی ڕەوانی ملە ملێی ئێوە لەگەڵ داگیرکەراندا، دیارە ئەبێ لە دەمیاندا بووبێتە پەڵاس، ئەگینا کەی دیلێتی و بێدەنگیان وتووە؟!

وەچەی ئێوە، خانەی باو و باپیری ناناسێتەوە! لە چارەڕەشی و بەدبەختی بەولاوە، ئەبێ چ ڕۆشناییەک ڕوو بکاتەوە لانەی نەرە شێرانی وەک ئێوە؟!





# نامەی ئازاد عەبدولواحید بۆ عەبدوڵڵا جەوهەر



**مامۆستا عەبدوڵڵا:**

**ئەم کاتەت باش**

داخم گرانە کە بیستم لە نەخۆشخانە کەوتبووی. لەبەرئەوەی سەری بەغام دابوو، نەهاتمە خزمەتت. ماوەیەکیشە یەکترمان نەبینیوە. لە یەزدانم داوایە بەزووترین کات چاک بیتەوە.
ئەم چیرۆکە بەپێزەتم خوێندەوە. زۆریش بە پەرۆشەوە خوێندمەوە. لە زۆر شوێنی دا دەوەستام. زۆرتر بیرم لێ دەکردەوە. ڕەنگە بیرەوەری تاڵی لای منیش وروژاندبێ. دەک دەستت نەڕزێ بۆ ئەم کوردییە بەتام و خۆشە.
بێگومان بزوتنەوەی ڕزگاری خوازانەی میللەتی کورد، لەپاڵ ئەوەی دەیەها، بگرە هەزارەها لاپەڕەی شانازی و خوێناوی بۆ خۆی نووسیوەتەوە. چەندەها لاپەڕەی ڕەش و ناهەمواریشی گرتووەتە خۆیەوە. ڕەنگە نەوەی ئەمڕۆکەمان کە نەوەیەکی تامەزرۆیە و دوژمنیش بە زۆر ڕێگە دەیەوێ تامەزرۆییەکەی شێلوو بکات و هەستەکەی کە هەستی پاک و دڵسۆزییە بشێوێنێ. لەبەرئەوەی کەم ئاگای لەو لاپەڕە ڕەش و سپییانەی مێژووی خەباتی نەتەوەکەمانە، بۆیە زۆرجار تووشی عاتیفەیەکی نەخۆش دەبێ کە بەزیان بۆ ئێمە دەشکێتەوە. بۆیە ئەگەر بێتو بە قەڵەمی چەلەنگتان ناوبەناو وەکو ئاگادارێک لەو ڕووداوانە بگرە وەک یەکێک کە ئیشت بۆی کردبێ، چەمکێکی ئەم خەباتە خوێناوییە لە وێنەیەکی هونەری — وەکو ئەم چیرۆکەتان — دابڕێژن، ئەوە دەتوانن بە بەردێ دوو چۆلەکە بەردەنەوە. لە لایەک نووسینەوەی ئەو مێژووە بە تەرازوویەکی عادیلانە. کە تەرازووی ویژدان و ڕاستییە و دوورە لە هەموو بەرژەوەندییەکی تایبەتی خۆتان. جگە لە دڵسۆزی و جگەر سووتانتان نەبێ بۆ مەسەلەی نەتەوایەتیمان، کە بەدەس بازرگانانەوە لە زۆر زووەوە شێوێنراوە. دووەم بە ڕۆشنایی خستنە سەر ئەم لایەنانە و داڕشتنی لە قاڵبی چیرۆکی ئاوەها کە خوێنەرانی کوردمان بەتاسەوە حەزی لێ دەکەن و بێزوو بەو جۆرە شێوەیە دەکەن زیاتر لە مێژوو و ڕووداوەکانیان نزیک دەکەیتەوە، بەدڵ و گیانیانەوە
دەنووسێ و پەندی لێ وەردەگرن. پیرۆزباییتان لێ دەکەم، یاخوا تەمەنتان هەر درێژ بێت و بژین.

دڵسۆزتان
ئازاد عەبدولواحید
سلێمانی
٩٨٢/٣/١٤

عەبدوڵڵا جەوهەر

# هەندێ دەنگی نامۆ لە زمانی کوردی دا

**مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر یەکێک لەو بوارانەی کە کاری تێدا کردووە، فەرهەنگی زمانی ئینگلیزی و کوردی بووە (هەندێ دەنگی نامۆ لە زمانی کوردی دا) یەکێک بووە لەو پڕۆژە گەورانەی ئەو، بەڵام بەداخەوە مەرگ ڕێگەی نەداوە تەواوی بکات، بە ناتەواوی و بە دەستنووس بەجێیهێڵاوە.**

**لەم فەرهەنگە ئینگلیزی و کوردییەدا لە ساڵی ١٩٧٦ تا ساڵی ١٩٨٢ کاری تێدا کردووە، چەند بەشێک لەو دەنگە نامۆیانەمان بە هەردوو زمانی کوردی و ئینگلیزی دەستکەوت پێمان خۆش بوو چەند وشە و زاراوەیەکی وەک خۆی لە ڕۆڤاردا بڵاوبکەینەوە.**

ئازووقە = ئازووخە victuaLs, provisions

ئاوقەد = عەمباز = ئەمباز بوون embrace

ئۆقرە (٤) (ئۆقرەگرتن) sit, standstill, patientLy

ئۆقیانووس (e) oceaN

ئەبڵەق staring vacantly

ئەڵقە (٤) ring, circle

ئەڵقە بەستن = ئەڵقەگرتن = ئەڵقەدان form

ئەڵقەڕێز door chain

ئەڵقە لەگوێ slave, obedientservant

ئێرەقان = یەرەقان jaun dice

ئێرەقە (هەوجار) veatical steering haft of plough

ئێسقان = ئێسکان bone

ئێسک قورس ugly, crabbed

ئیفاقە (٤) convalescence

ئێقە- یەمە کردنەوە vomit

ئیقلیم (e) clime, region

باسقەندە walking – stick



باسقەندە pipestem

باسوومە grape – juice jelly

باشقاڵ (چاو باشقاڵ) gladeyed, flirtious

باقان – باقاندن – باقین bleat

باقڵ – باقڵێکم – باقڵم as it seems to me, apparently

باقە blweat, bundle, bunch

باقە بامە continuous

باقە گوڵ nose gay

بریقانەوە= بریسکانەوە glitter, shine

بریقەو هوڕ = بریسک و هوڕ glitter

بریقە = بریسکە glitter, shine

بریقەدار = بریسکەدار glittering

بڵق bubble

بڵقەدان = بڵقە هەڵدان bubble

بڵۆق blister

بڵقە بڵق bubbling

بۆق frog

بۆقڕان to detriment of

بۆقڕاندن make in auspicious remark for


هەندێ دەنگی نامۆ لە
زمانی کوردی دا
(ب)





دەستوخەتی عەبدوڵڵا جەوهەر

# یادەکانی عەبدوڵڵا جەوهەر و نرکەی ڕاستییەکی مێژوویی



د. عەبدوڵڵا ئاگرین



لەتاو هەناسەی ژانی بە سوێی گەڵا و هاواری شینی بە سۆزی مەرگی گوڵ، چپەی گریانی بارانی شارەکەم، بە تاو بەسەر گۆنای ئاوازی سەمای پۆلە ڕیشۆڵە تەزیوەکانی چیای خۆمەڵاسداوی ئەزمڕدا، دائەکات و لە تافی بەهاری بەردەرکی سەرا، کەیل و مەستی بیرکردنەوەیەکی هیوابەخش و گزنگی بەرخودانی زەردە پەڕی خەزان بە عەشقەوە لە باوەش ئەکات و سەرچۆپی ئاهەنگی کوڵمی داگیرساوی ئەو بەستەیە» عەبدوڵڵا جەوهەر» ئەیچڕێ... وەی لە وەشتی ئەو خەمە بزڕکاوەی، لە ناخیدا هەڵیکردوو تا هەنووکە نهێنیی گزنگی هەتاوی ناو ئەو پریاسکەیە بەهادارەی فیکر و هەڵوێستی هەڵچووی «عەبدوڵڵا جەوهەر» نەدرکاوە.

یاران: نەک لەسەر ئاستی هەڵوێست و ئاکامی ژیانی: ( سیاسی، ئەدەبی، ڕۆشنبیری) مرۆڤە بلیمەت و هەڵکەوتووەکانی شاری سلیمانی.. بەڵکو ناکرێت لەسەر ئاستی کوردستانی گەورە ناوی مرۆڤێکی دیاری بزوتنەوەی فیکری پێشکەوتووخواز و نەتەوەپەروەریی بهێنرێت. عەبدوڵڵا جەوهەر فەرامۆشکرێت! من نە تەمەن و نە نزیکییەکی شیاو، نەمەی ئەو بەختە بەتامەی پێنەبەخشیم، کاتێکی ئەوتۆی جریوەدار لە نزیکەوە دنیای فیکر و هەڵوێستی نەتەوەیی ئەو مرۆڤەدا بژیم.. ئای لەوکاتەی دەمەدەمی نیوەڕۆی ڕۆژێکی مانگی ئەیلولی ١٩٥٩بوو، ئەو دەمە ناویشم نەبیستبوو.. بە تەنیا لەبەردەم مزگەوتی گەورەوە ڕووە و بەردەرکی سەرا ئەڕۆیشتم.. نازانم چۆن و چ هێزێک بوو، حەسرەتی حەسانەوە، ڕووە و چایخانەکەی ساڵحی وەستا بستەی تەنیشت سینەمای ڕەشید ڕایکێشام.. من هەر لە منداڵیمەوە.. تەزووی حەزی دانیشتنی ناو چایخانە لە دەروونمدا مردبوو، پێشم سەیربووە.. مرۆڤ هەن ماوەیەکی زۆری ژیانی گوڵی ناسکی تەمەنیان بە دانیشتن و داڵغە لێدان، یاخود بە یاریکردنی ناو چایخانەوە، بە «با» ئەدەن! بەرەو چایخانەکە ڕۆیشتم «سا» لە ڕووی شەرمەوە بوو بێت، یان هەر هۆکارێکی دی، بێ کەلام و سەلام لە نزیک مرۆڤێکی ئێسک سووکی بەرە باریکەلە و لاوازەوە دانیشتم، دوای کەمێک ئەو مرۆڤە بێ فیزە بە ڕوویەکی خۆشی زەردەخەنە ئامێز، بە دەست و پەنجە شمشاڵییەکەیەوە فەرمووی: کاکە بەخێر بێیت!! ئەو هەڵوێستە جوان و ڕەسەنە کوردییەی، بەزوویی تەنگی بە بیرکردنەوەی هەرزەیانەی هەڵچنیم.. تینی خۆزگەیەکی خورپەداری لا خولقاندم.. پەرۆشی سەرسامبوون بەو مرۆڤە مەزنەوە، بە شێوەیەکی سروشتیی بۆ لای خۆی بە کێشی کردم.. ئیدی حەزم ئەکرد بزانم ئەم مرۆڤە کێیە و لێشی نزیک ببمەوە.. وەلێ حەز و بەختی خۆم مەلێکی پەڕ و باڵ کراو بوو.. ئەو هیوایەم لە بناری چیای سەختی ڕۆژگاردا مایەوە.. دواتر لە دنیای خوێندن و خوێندنەوەی



عەبدوڵڵا جەوهەر، لە فەرمانگەی موتەسەریفی سلێمانی

کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا سەرقاڵبووم و ئاشنای ژیان و ڕەوش و فیکر و خەبات و ئامانجی عەبدوڵڵا جەوهەر بووم.. ئەمە و سەرەڕای ئەوەی هاوڕێ و هاوبیری قوتابێتیم لە قوتابخانەی ئامادەیی پیشەسازی سلیمانی کاک تایەری حەمەئەمین ماوەتی، خزمایەتییەکی نزیکی لەگەڵ عەبدوڵڵا جەوهەر هەبوو (وابزانم خاڵی بوو) لەو سەرچاوەیەشەوە زانیاری ورد و باشم پێبرا.. کات هات و ڕۆیشت.. من زۆر هاموشۆی دوکانی شێخ محەمەدی هەرسینم لە شەقامی مەولەوی ئەکرد.. مانگی ١٢\ ١٩٦٢بوو.. کاک شێخ محەمەد زەرفێکی بە پێچراوی دامێ (من ئەمزانی ئەوە بەیان ـی سیاسییە) فەرمووی: زەحمەت نەبێ ئەمە بدەرە دەست کاک عەبدوڵڵا جەوهەر، ئەو شوێنانەشی دیاریکرد کە تێیدا دائەنیشت و فەرمووی ئەگەر وتی: ئەمە چییە و کێ داویتێ؟ یەکسەر بڵێ نامەیەکی شێخ محەمەدی هەرسینە، ئیدی هەر بە پێوە سەربوردەیەکی کورتی ژیانی عەبدوڵڵا جەوهەری بۆ باسکردم، من دەمودەست بەرەو چایخانەکەی مام ساڵحی مام بستە چووم »ئەو» لەوێ نەبوو.. یەکسەر بەلای سەعاتەکەی سەر دیواری دایەرەی بەرید دا وەرچەخام و بۆ ئـەوبـەری شەقامەکە پـەڕیـمـەوە. ئەوسا دیـواری قوتابخانەی فەیسەڵییە محاجەرەی ئاسن بوو.. بەڕێکەوت لەبەر دیوارەکەدا بەیەکگەیشتین، بەلای یەکدا تێپەڕین، وا تەسەور ئەکەم هەر منی نەناسیبێت. منیش نامەکەم لە گیرفانی لای ڕاستی شەرواڵەکەمدا شەتەک بوو.. ئاوڕم دایـەوە وتم: مامۆستا عەبدوڵڵا: وریایانە لایدایەوە و لە شوێنی خۆی وەستاو چاوەڕوانی قسەوچوونە پێشەوەی منی ئەکرد.. ئەوسا شەقام و شۆستەکان وەک هەنووکە چڕ و بەیەکداچوو نەبوون.. یەک دوو هەنگاو بەرەو رووی ڕۆیشتم لەبەردەمیا وەستام: من زۆر بە سڵەمینەوە (حەزەرەوە) نامەکەم لە گیرفانم دەرهێناو دامەدەستی، ئەویش ئازایانە و نەترسانە بێ یەک و دوو لێی وەرگرتم، ئەمە بێ ئەوەی بڵێت: ئەمە چییە؟ هی کێیە و کێ ناردوویەتی؟ نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو فەرمووی: کاکە بۆچی بە سڵەمینەوەوە دەست بە گیرفانتا ئەکەیت و نامەکەم ئەدەیتێ؟ ئەی نازانی ئەو حاڵەتە گومان دروست ئەکات و سەرنجی سیخوڕ بۆ لای خۆی ڕائەکێشێت؟! ئەوەندەی فەرموو وتی: سوپاس و خواحافیزی کرد. بەڕاستی ئەو هەڵوێستە جوامێر و نەترسانەیەی بۆ جاری دووەم زۆر پۆزەتیفانە سەرنجی بۆ لای خۆی ڕاکێشام. بەوەی کەسێکی بەڕێزە و کرمی دوودڵیی و ڕاڕایی لە دڵیدا نییە.. ئا ئەوە مەدالیای مەزنی و زیندوێتی بە بەرۆکی بەژنە کەڵەگەتە مێژوووییەکەدا هەڵواسیوە.

**خورپەی شنەی فیکر و**

**هەڵوێستی ژیانی عەبدوڵڵا جەوهەر**

لە سەرەتای تەڕی بەهاری هەرزەیی کێوی هیوای گەشی عەبدوڵڵا جەوهەر، بێ باکانە و لە خۆ بوردوانە، جەژنی تێکۆشانێکی سەرسوڕهێنەری لە کۆڕی ئاگربارانداا بینیوەتەوە، خۆی لە شتە باوەکانی ئەو دەمە لا ئەدا و لێی یاخی بووە و عاقڵانە و سەردەممانە بە گژ بنیادگەرایی لاسایکردنەوە و مشەخۆری سەرخوانی بیروبەرژەوەندی خۆویستی و چاوەڕوانکردنی دەسکەنەیی بێگانەدا چووە. سەرباشقەی ڕەسەنی، کڵپەی گڕکانی بیری ڕەسەنی نەتەوەیی و ئەو گیانە بەتینە شۆڕشگێڕانەیە، چەشەی بەتامی، چریکە و هەوێنی بەپێزی لەبەری ڕەنجی ماندووبووی لێکدانەوە و چالاکی پراکتیکی لە دەریای ناوازەی بەرهەمەکانی تێکڕای بوارەکانیدا، بوونی کردەیی و کاریگەری پۆزەتیڤانەی بووە. زیرەکی و بیرتیژیش بارتەقا ڕەوتی کاروانەکەی ژیانی بووە.

**ساباتی خوێندنی لە قوتابخانەی فەڕمی**

ئەوە لێوی ناسکی شنەی جووڵەی هەست و لێدانی دڵە، وایکرد، باوکی عەبدوڵڵا جەوهەر لە گوندی قەشەنگی »مێوڵی» ی ناوچەی قـەرەداخـی خـاوەن ڕۆشنبیری و ئەدیبانی کـوردەوە، ڕوو لە کوانووی بەتین و تاوی پایتەختەکەی بەبەی کورد »سلێمانی» بکات، هاواری ئۆخەی دەروونی، وایکردووە پشتێنی ورەی هیوایەکی گەش ببەستێت و خۆی لەگەڵ گڕی پشکۆ داگیرساوەکانی شاردا بگونجێت و ڕوو لە قوتابخانەی فەڕمی بکات.. فیکری تیژ و قووڵ و وردی، نەغمەی هەنسکی داهێنانی لە مێشک و دەروونیدا ئەچڕان، ئەو توانا فیکرییە و ئەو لێوەشاوەی چالاکییەی وایکردبوو تەنیا مەلی شەرمی بەسەر گۆنای خوێندنی قوتابخانەوە نەگیرسێتەوە.. پەلوپۆی بەهرەی بۆ دنیای ئـەدەب و ڕۆشنبیری و سیاسەت هاویشت. ئەگەرچی دۆخی تایبەت و ئەشکی حەسرەتی میللەتی کورد، ئەو ئەرکەی بەسەر ڕۆڵە دڵسۆز و هۆشیارەکانی کورد دا سەپاندووە.. مرۆڤی هەستیار و نەتەوە و نیشتمانپەروەری کورد لە چەند بوارێکدا چالاکی بنوێنێ.. عەبدوڵڵا جەوهەریش لەو نەرێتە لاینەدابوو، وەلێ جێی ئاماژەیە.. لەو بوارانەی چالاکی تیا نواندووە، بەکامی دڵی خۆی، پێگەیشتووە ئەمە نەک لە رووی خۆویستی و خۆدەرخەرییەوە، بەڵکو لە رووی کوڵی دڵسۆزییەوە، شان بەشانی کوڕە دەرکەوتووەکانی شار لەوانە شێخ لەتیف شێخ مەحموودی حەفید هەنگاوی ناوە و زۆر پێشیانکەوتووە. قوتابخانەی سەرەتایی لە شاری سلێمانی و ئامادەییشی لە شاری کەرکوک تەواوکردووە. تەزووی هەستێکی تایبەت بە



خۆی و جریوەی ئارەزووی بەرخوردانێکی دنیای یاخیبوون وایکرد درێژە بەنرکەی خوێندنی فەرمی نەدات.

### کاروانی ڕووە و چەپەری بەخششی، چەپکە وشەی ڕەنگالەی ئەدەبێکی داگیرساوە

عەبدوڵڵا جەوهەر لە نێو کلووی بەفری خوێندنی قوتابخانەدا، پشکۆی داگیرساوی بەهرەو لێهاتوویی لە دنیای ئەدەبیدا بینیوە و بە شێوازێکی نایاب و زۆر ناسکی سەرنجراکێش ڕووی لە لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی «ژین» ی پیرەمێرد و گۆڤارە ناواز و مەزنەکەی گەلاوێژ کرد. ئەو قەڵەمێکی بە بڕشت و پڕێنەری ئاوازی نوێی شۆڕشگێڕی و نرکەی بەهێزی بەهرەی داهێنانی نوێی ئەدەبی بوو، وەک لە مامۆستای مەزنمان و شاعیری هەڵکەوتووی کورد هەردیم بیست: لە ساڵی ١٩٤٨ەوە، لە بەرژەوەندی گەشەداری ئەدەبی کورد ویستبووی لەگەڵ ڕۆشنبیرێکی ئەو سەردەمە، «مەحموودی فەقێ محەمەدی هەمەوەند» پرۆسەی کودەتایەکی ئەدەبیی شۆڕشگێڕانە بەسەر دنیای بزافی ئەدەبیی و ڕۆشنبیری کوردیدا بهێنێت.. ئەم خۆی بۆ چوونە دنیای ناوەڕۆک و ڕووخساری لێکۆڵینەوە و شیتاڵکردن و هەڵوەشاندنەوە و بنیادنانەوەی بەرهەمەکانی پیرەمێرد تەرخان کردبوو.. وەلێ ئەم کارەیان لە دایک نەبوو، یاخود بە جوانەمەرگی سەری ناوەتەوە، مرۆڤیش ناتوانێ هیچ جۆرە حوکمێکی بەسەردا بدات.. ئەو لە بواری ئەدەبیدا: وتاری ئەدەبی لە شێوەی: (لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن) دا بڵاوکردۆتەوە و پەخشانی ئەدەبیی و کورتەچیرۆکیشی وەبەرهەم هێناوە.. شیاوی ئاماژە پێکردنە.. لە تەمەنی هەڵکشاوی هەر هەموو نووسینە ئەدەبییەکاندا»وتار، پەخشان، چیرۆک» شنەی هەنسکی بەتام و شەپۆلی بیری جوان و نەتەوەپەروەرانە و نەستی ناسکی عەشقێکی خاوێن و سۆزی ئەدەبی نمەی بارانی داهێنانی نوێی بەسەردا ئەڕێژێت.. ئەوەش لە کەم بەرهەمیی نووسەرێکدا بەدی ئەکرێت»ئەو» بە زۆر نازناوەوە بەرهەمەکانی بڵاوکردۆتەوە: «ع.چالاک، ع.ج، جیم، ع.جەوهەر».

### سەرچنی ورشەی جوان و پاکی چالاکی سیاسیی

تروسکەی هیوای گەش و ورەی بڵند و بڕوا بەخۆبوونی عەبدوڵڵا جەوهەر، وایکردووە لەباتی ئەوەی بۆ دۆخی ژیانی ژێردەستی کورد، نمەنم فرمێسکی تاسە و دڵۆپی ئەشک بڕێژێ، یاخود لە دوورەوە ئاخ پڕ بە سیەکانی هەڵکێشێ، ئەو بەدەم بارانی خەمەکانیەوە ئازایانە و نەترسانە باسکی مەردایەتی و مەچەکی بەهێزی بۆ کاروچالاکی سیاسی تەرخانکرد، بێ سڵەمینەوە ڕووی لەناو گڕکانی مەرگ و تێکۆشان کرد و کاتێک ساڵی ١٩٣٨ لە کەرکوک ئەیخوێند، لەگەڵ قوتابییە خوێنگەرم و دڵسۆز و نەتەوە پەروەرەکاندا بە تایبەت لەگەڵ «دڵدار» ی شاعیر و نوری شاوەیسی نیشتمانپەروەر و چەند قوتابییەکی دیدا، حیزبێکی سیاسییان بە ناوی «کۆمەڵەی دارکـەر»ەوە دامەزراند.. ئەگەرچی ناوەکەی لە حیزبی دارکەری ئیتالییەوە وەرگیرابوو، وەلێ: شێوازی بیرکردنەوە و ڕێباز و ئامانجی ئەو حیزبە: دوور بوو لە هەستی دەمارگیری و توندڕەوی و شۆڤێنییەوە، ئەوەش وایکردووە، لە پیاچوونەوە و هەڵسەنگاندنی مێژووی دامەزراندن و خەبات و ئامانجی کۆمەڵەی دارکەر تا هەنووکە بە درەوشەداریی و پیرۆزیی و گرنگییەوە لە لایەن دۆست و نەیارانی کورد و کەسان و هێز و حیزبی سیاسیی کوردی و عەرەبییەوە ((بە نەتەوە پەروەر و مارکسی و ئیسلامی و بێ لایەن))ەکانەوە بە جوانی و بە باشی هەڵسەنگێنرێت .

### گوڵبارانێکی جوانی عەبدوڵڵا جەوهەر لە دامەزراندنی کاژێك و مەرگی هەتاودا

کێوی ئاگرینی ئامانجی فیکری (( تێوری )) و هەڵوێستی نەترسانەی کردەیی»پراکتیکی» عەبدوڵڵا جەوهەر، هەڵوێیەکی سەرباڵ ئاڵی بیر تیژ و چالاک بوو.. «ئەو» بە ئاسانی دەستەمۆی فیکر و کار و چالاکی هیچ ڕێکخراو و حیزبێک نەئەبوو، وەلێ چەخماخەی ئاگراویی ئەمجارەیان، بە گوڕی بڕواکردن و جۆشێکی بەتینی شۆڕشگێڕانەوە، ڕووی لە دڵی گەرمی چالاکی حیزبایەتی کرد... وەک: مامۆستا هەردی، کامیل ژیر، بۆیان باسکردم ... لە ساڵی ١٩٥٩ دا و پاش پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ و چەند بە یەکگەیشتن و تاوتوێکردنێکی واقیعیانە و لۆژیکیانەی ڕەوشی سیاسی عێراق و دۆخی خەباتی کورد، پێکەوە لەگەڵ مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر لە ١٩٥٩/٤/١٤ (( کۆمەڵەی ئازادی و ژیانەوە و یەکێتی کوردیان _کاژێک_)) لەگەڵ چەند هاوبیرێکی دیدا لە شاری سلێمانی دامەزراند و عەبدوڵڵا جەوهەر ڕۆڵێکی دیاری لە ڕەنگڕشتنی سیاسەت و فیکری کوردایەتی و پێکهێنانی کاژیکدا هەبوو.. وەک: خۆشەویستان (( هەردی ژیر)) ئاماژەیان پێکرد.. لە ئەنجامی دەست و خامەی ڕەنگین و بیری تیژ و زیرەکانەی و شارەزایی لە مێژووی سیاسی کورد و نەتەوەکانی (( ڕۆژهەڵاتی ناوین)) و جیهانیدا ئەوە عەبدوڵڵا جەوهەر بوو (( کاژیکنامە ))ی نووسیوە و داڕشتووە و دواتر هاوبیرانی دی پیاچوونەتەوە و ئەوسا لە لایـەن دەستـەی دامـەزرێنـەری کاژیکەوە: «مامۆستا هەردی، دکتۆر جەمال نەبەز، مامۆستا کامیل ژیر، مامۆستا فەرەیدون عەلی ئەمین، مامۆستا عەبدوڵڵا

جەوهەر، مامۆستا فایەق عارف، دکتۆر ئیحسان فوئاد»ەوە بڕیاری لەسەردراوە...... ئەوە ئەمانەتی ئەدەبیی و بەهای بەرزی ئەخلاقی سیاسی نەتەوەییمانە وائەکات ئەو لاپەڕە درەوشــاوە و نــەزانـراوەی عەبدوڵلا جەوهەر «نووسینی کاژیکنامە» وەک خۆرێکی هەمیشەیی لەبەرچاومان بێت.. داخەکەم جێدەست و پەنجەی کار و چالاکی ئەدەبیی و سیاسیی ئەو لە کاژیکدا مەرگی هەتاوە.. ئەگەرچی عەبدوڵلا جەوهەر لە ساڵی ١٩٦٢ەوە وازی لە کاژیک هێنا. لای من نەبوونی زانیاری ڕاست و دروست ژانی بەسوێی زامی دڵ و مێشکمە.. ئەو مرۆڤە لە ساڵی ١٩٢٠ لە گوندی «مێوڵی» قەرەداغ لە دایکبووە و لە ئێوارەی ڕۆژی سێشەممە ١١ \ ٦ \ ١٩٨٢ بە نەخۆشییەکی کوشندە بێ دەنگ و ئەسپایی، چەند مانگێک لەسەر قەرەوێڵەی مەرگ ڕاکشابوو.. مەرگی هەتاوی بەهرەدار و بەخشندەی پێگەیاندین..

●هەڵوێستی بوێرانەی، مەدالیای مەزنیی و زیندوێتی بە بەرۆک و بەژنە کەڵەگەتە مێژووییەکەدا هەڵواسیوە.

●تەزووی هەستێکی تایبەت بە خۆی و جریوەی ئارەزووی بەرخودانێکی دنیای یاخیبوون، وایکرد درێژە بە نرکەی خوێندنی فەرمی نەداوە.

●»ئەو» لە ساڵی «١٩٤٨» ەوە ویستبووی لەگەڵ چەند ڕۆشنبیرێکی ئەو سەردەمە، لە بەرژەوەندی گەشەداری ئەدەبی کوردی، کودەتایەکی ئەدەبی نوێی شۆڕشگێڕانە، بەسەر گیان و جەستەی بزاڤی ئەدەبی کوردیدا بهێنێت.

●کێوی ئاگرینی ئامانجی فیکری»تیۆری» و هەڵوێستی نەترسانەی کردەیی «پراکتیکی» ی عەبدوڵلا جەوهەر، هەڵۆیەکی سەرباڵ ئاڵی بیرتیژ و چالاک بوو.

●ئەوە: ئەمانەتی ئەدەبیی و بەهای بەرز و پیرۆزی ئەخلاقی فیکری سیاسی نەتەوەییمانە، وا ئەکات گەوهەری دوو توێی پریاسکە «ونبووەکە»ی عەبدوڵلا جەوهەر - نووسینی کاژیکنامە- گزنگی خۆرێکی هەمیشەیی بێت.

## دوا وتەم بۆ گوڵێکی ژاکاو

ئەوە تەزووی هەنسکی ڕۆحی گوڵێکی دڵژاکاوی مرۆڤێکی کوردپەروەرە، ئەوە بۆی هەناسەی پرۆشەی بەفر و شەونمی سەر گۆنای خونچەی وەنەوشەیی و لەرەی ئاوازی بێ دەنگی نمەی تۆراوی بارانی سەرەتای وەرزی خەزانی (ع.چالاک)ە.. ئەو بەرگی بێ فێزیی لەبەری خۆی دادڕیوە، بیری ورد و هزری داگیرساوی، گەردنی عەشقی خاک ماچ ئەکات و لە لوتکەی هۆشیارییدا، بە نەوازشەوە کڕنووش بۆ گزنگی هیوای گەشی کورد ئەبات. ئەم لاوە بە هیمەتەی شار، مشتەریی هەمیشەیی قەلەندەرخانەکەی سەعیدی گەوهەر بوو.. «ئەو» مرۆڤێکی ڕۆح سووک بوو، چاوە کزەکانی شەپۆلی خۆشەویستی و شنەی هیوای ئەپژان، پەنجەی هــەردوو دەستەلاوازەکانی، هەر ئەتوت: بۆ ئــەوە خولقاوە، خامەی بیری تریفەداری بۆ نەتەوە و مرۆڤایەتی تەرخان کات.عەبدوڵلا جەوهەر لە





هەرزەیی بەهاری تەمەنیەوە حەللاجانە، هەڵگری بیری واقیعی و هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی نەتەوەیی و مرۆڤانە بووە، «ئەو» بە جورئەتەوە ڕووبەڕووی ئەو بیروباوەڕە پوکاوانە ئەبووەوە کە ئەیانویست بیانووی ئیفلیجانە بۆ ئەوە بدۆزنەوە، مەشخەڵی هەق و مافی نەتەوەی کورد بکوژێننەوە، ئەم مرۆڤە بێوەی و میهرەبانە تا ئەو ساتەی مۆمی ژیانی بە هەمیشەیی کوژایەوە، لەگەڵ خۆی و بیروباوەڕ و ئامانج و پەیامی پیرۆزی نەتەوە و مرۆڤایەتیدا، ڕۆشنبیرانە و مەعریفانە بە وەفا و سەر ڕاستبوو. ئەو مرۆڤە ژیر و ڕۆڵە هوشیارەی سلێمانی بێوچان شەونخوونی بۆخەمە ئەرخەوانی و ئامانجەکانی کورد لە خەڵوەتی عەشق و دڵسۆزیدا ئەگوزەران، بێ کرووزانەوە و دۆشدامان و بە بڕوایەکی پتەوەوە، چاکی جوامێری لێهەڵماڵیوە و لە بواری وشەی پیرۆز و ئەدەبی نازدار و شیرینی کوردی لە کۆتایی گرێی سێیەمی سەدەی بیستەمەوە، تا کۆتایی گرێی چوارەم، شۆڕە سوارێکی نەگلاوی بەرهەمی ئەفراندنی نوێی کوردی بوو.. لە بواری وتار و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی و نووسینی کورتە چیرۆکی هونەریی، قەڵەمێکی داگیرساوبوو.. بە نازناوی: ( ع.چالاک، جیم، ع.ج، ع.جەوهەر) لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەدا، بە تایبەت: گەلاوێژ و ژین، نووسەرێکی دیار بوو.. لەو دەمەدا (ع. جەوهەر) و دوو نووسەری دی بە نیازی ئەفراندنی پرۆسەی بزوتنەوەیەکی نوێی ئەدەبی و فیکری بوون.

مەخابن تامی تنۆکی بەلەزەتی ئەو مەبەستە وەنەوشەییەی، بە نمەی ئەسرین خامۆشکرا.. گیانە نەسرەوت و هەستە بزێوەکەی خۆی لە دەست قەدەر ڕائەپسکان و جەسوورانە ڕووی لەسەرچۆپی گرتنی بەهای باڵا و بە نرخی دنیای سیاسەت و حیزبایەتی کرد.


دولت علیهٔ عثمانیه تذکرهٔ سیدر

وێنەی ناسنامەی باپیری (عەبدوڵڵا جەوهەر) لەسەردەمی عوسمانیدا



**عەلی کەریم**

# جەوهەرێک بە جەوهەر

ناسینی مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر ڕێکەوت بوو، لە ناوەڕاستی شەستەکاندا من لە قۆناغی ناوەندیدا بووم، یەکەم بینین پرسیاری چەند وشەیەکی ئینگلیزیم لێ کرد، دواتر پرسیاری ترم چەند جارێک و چەند ڕۆژێک دووبارە لێ ئەکردەوە.. تا دواتر کەوتمە سڵاو لێکردنی، بەڵام هیچی ئەوتۆم دەربارەی نەئەزانی. ساڵان ڕۆیشت، ئەم پەیوەندی و یەکترناسینە پەرەی سەند، بەتایبەتی کە زانیم هاوڕێی خوالێخۆشبووم کاک «شەماڵ عەزیز» ئەیناسێت و هاوڕێی باوکیەتی. ئیتر لەگەڵ کاک شەماڵ دا هەتا کۆتایی ژیانی پەیوەست بووین پێوەی.

مامۆستا پیاوێکی مامناوەندی، قژلوول، قسەخۆش، زۆر لەسەرخۆ، زیرەک، بێ فیز، شارەزایەکی باش لە مێژووی کورد دا، خوێنەرێکی بەردەوام، زمانزان، بەهۆی خوێندنەوەی زۆرەوە، شارەزاییەکی باشی لە سیاسەت دا هەبوو، ئەگەر لە بارەی نووسینیشەوە باس بکرێت، ئەوا کوردی زان و زمان پاراو بوو.

دەربارەی بیروباوەڕ، بیرو باوەڕێکی پاک و قایم و کوردانەی نەتەوەییانەی هەبووە و لە ژ. ک ئەندام بووە. زۆرجار باسی یادگارییەکانی ئەو سەردەمەی بۆ ئەکردم. هەستێکی پاکی هەبوو، ئاواتی ئەوە بوو کورد قەوارەی خۆی هەبێت، بەڵام بەداخەوە کۆچی دوایی کرد و ئاواتەکەی نەهاتەدی. هاوڕێ و هاوبیرەکانی کەم بوون، کەسانی دەگمەن بوون، دەروێشی کوردستان بوو کە سەربەست بێت. ئەو کەسانەی ئەم متمانەی پێ ئەکردن کەم بوون و هەڵبژاردە بوون.

مامۆستا خێزانی پێکەوە نەنا، زۆرجار داوامان لێ دەکرد خێزان پێکبهێنێ، دەیگوت: (کۆیلە بۆ دوژمن دروست ناکەم). ئەڵێن نهێنی

هەبووە لەوەی ژنی نەهێناوە، ڕای سیاسی وەها بوو. ئەبێت تەنها شەڕی کورد بۆ ڕزگاری بێت، گرنگ ئەوەیە قەوارەیەکت هەبێت.
زۆر باسی ئەم کەسایەتییانەی ئەکرد: غاندی، ئـازادی و سەربەخۆیی بۆ هیندستان. غالیبالدی، بۆ یەکگرتنەوەی ئیتاڵیا. بسمارک – ئایخمان – چەند ڕقی لە جولەکە بوو.. بەمانا شۆڤینیەکەی نا. سمکۆی شکاک، هەتا زۆر سەرگوزشتەی ڕێگای ئازادی گەلانی باس ئەکرد، لە ڕۆژهەڵات یان ئەوروپا یان ئەفریقا. ئەو سەرکردانەی بە باشی باس ئەکرد کە میللەتەکانی خۆیانیان ڕزگار کردووە، بەهەر نرخێک بووبێت.
دەیان باس و خواسی ئەو میر و دەسەڵاتدارانەی کوردی لابوو، ئەوانەی ئەگەر هەوڵێکی بچووکیشیان دابێت بۆ خودموختاری. باسی ئەو جاش و خۆفرۆشانەی ئەکرد کە لە زۆربەی زۆری کاتدا خۆیان لە دەستەڵاتدا بوون، یان نزیک بوون، یان بە فیتی دوژمن چوونەتە سەر میرێکی تر، یان هەر لە هەمان میرنشینیدا خیانەتیان کردووە و بوونەتە پیاوی بێگانە.
ڕەخنەی زۆری لە سەڵاحەددین و کەریم خانی زەند ئەگرت، کە بەو هەموو دەستەڵاتەوە هیچیان بۆ کورد نەکرد.
ئەیوت: "پشتبەستن بە دوژمن، خیانەتە، کەی کاری پێت نەما لەناوت ئەبات"، دە نموونەی ئەهێنایەوە بۆ هەر بابەتێک. لە ساڵەکانی شەست دا ڕەخنەی لە شۆڕش هەبوو کە پشت بە ئێران ئەبەستێت... هتد.
کە بەیانـی ١١ی ئازار دەرچوو، لای باش نەبوو، ئەیوت: حوکمی زاتـی، مانای دیاریکردنی ناوچەیەک و ئەندازەی دەستەڵاتەکانی یاسا دانان، کە ئەمانە هیچیان لەم بەیاننامەیەدا نین و دواخراون.
ئەیوت: بەندەکان هەریەکەیان وەک قونبولەیەک وان، دوو شریتی پێوەیە، هەر لایەک ویستی ئەیتەقێنێتەوە.
ساڵی ٩٧٤ داوای لێکرا بچێتە دەرەوە، بەڵام کە بەیاننامەکەی مەکتەبی سیاسی پارتی دەرچوو، هیوا بڕاو بوو لەوەی ئەمە شەڕی دروستکردنی دەوڵەتی کوردییە.
لە ساڵەکانی شۆڕشدا بە درێژایی، هەتا کۆچی دوایـی، سەرنجەکانی خۆی بۆ باس ئەکردم کە لەم نووسینەدا جێگای نابێتەوە.
مامۆستا عەبدوڵڵا، زۆرجار باسی ئەو کەسانەی ئەکرد کە کاژیک بوون، یان لەسەر ئەوان دائەنران، یەکە یەکە متمانەی بە هەندێکیان ئەکرد و ڕەخنەی لە هەندێکی تر ئەگرت. لە سەرەتای هەشتاکان و کۆتایی حەفتاکان دا، داوای لێکرا لەگەڵ دوو هاوتەمەن و هاوبیری خۆیدا بچێتە دەرەوە، کە یەکێکیان خوالێخۆشبوو سەعیدی گەوهەر و، ع. س بوون، کاک سەعید زۆر ئامادە بوو، بەڵام ع. س ڕاڕا بوو، مامۆستا عەبدوڵڵا بەجۆرێک ڕازی بووبوو کە بچنە دەرەوە لای پاسۆک و خەریکی نووسین و بڵاوکردنەوەی بیری پاکی نەتەوایەتی بن، بەڵام نەخۆشی مەودای نەدا.
مامۆستا عەبدوڵڵا، گۆشتی سووری نەئەخوارد، زۆرتر خواردنی سووکی ئەخوارد (نیوەڕوان لە دەرەوە).
ڕەخنەی لەوانە ئەگرت بە بەرگریکارانی کوردیان ئەوت کوژراو و بە داگیرکەرانیان ئەوت "شەهید".
مامۆستا لە ژیانیدا، لەجێگەی خۆی نەبوو، ئەو شایستەی زۆر شت بوو، لە دوای مردنیشی هیچی بۆ نەکرا. نە شەقامێک، نە کتێبخانەیەک، نە قوتابخانەیەک، بەناوی ئەو کەڵە پیاوەوە ناو نەنراوە. ئەوە نەبێت ئەو کتێبخانانەی پێشکەشی کردوون بە کتێبخانەی گشتی و مۆزەخانە، بەناوی ئەوەوە ماون.
ئـەو هەموو نووسین و چیرۆک و شیعرانەی هەیەتی و ژمارەیان زۆرن، کەس بە چاپی نەگەیاندوون، ئەوەی هەیە ئەو نووسینانەن کە لەژێر ناوی خوازراو، یان چەند پیتێک بڵاوبوونەتەوە، لەگەڵ نامیلکەیەک بەناوی ئـاوات، کە هێشتا لە قۆناغی ئامادەییدا بوو چاپ کراوە و (مێجەرسۆن) قەدەغەی کردووە.
ئـەگـەر یەکێک تەنها ئەو نووسینەی لەسەر زمانی [عەلی سیدۆ گۆرانی] نووسیویەتی بخوێنێتەوە، گەلێک شارەزا ئەبێت لە جۆری بیرکردنەوەی مامۆستای گەورە.
هەزار سڵاو لەگیانی پاکی.



عەلی کەریم – عەبدوڵڵا جەوهەر ١٩٧١



# چوار نووسینی کورتی

## عەبدوڵڵا جەوهەر

عەبدوڵڵا جەوهەر، هیچ نووسینێکی بەناوی خۆیەوە بڵاونەکردووەتەوە، ئەوەی بڵاویکردووەتەوە بەناوی (ع. چالاک) (ع) (ج1) (ع.جەوهەر) (ع ج)، بە تایبەتی لە هەردوو گۆڤاری گەلاوێژ و ڕۆژنامەی (ژین)دا بووە، ئێمە لەو نووسینانەی ئەو، تەنها چوار نووسینمان هەڵبژاردووە و لێرەدا وەک خۆی بڵاویان دەکەینەوە.

ڕۆڤار







## من و یارم

### عەبدوڵڵا جەوهەر
### ١٩٤٤

لەو ڕۆژەی گرێی دڵداریم لەگەڵ یارا بەستبوو، بە تەما و ئاواتەخوازی تاوێک بووم، لە تەکیا، لە پەنای یەکا، ڕازی دڵی خۆمان بچرپێنین بە گوێی یەکترا. تا لە بەیانییەکی بەهاری نەشەدارا، لە گورچەی کۆڵانێکا، لە پڕ لووتم تەقی بە لووتی ئەو یارە نازدارەوە، کە لە زووەوە وێڵ بووم بە دوایا. لەژێر پەردەیەکی پڕ نازا ئەم سکاڵایەی خوارەوە لە دووتوێ شەماڵی دڵداریانا بەرپا بوو.

یارم، دیدەم، بینایی چاوم، هێزی ئەژنۆم!

تاکەی هەموو ڕۆژ، بە تیلایی چاوە گەشەکانت، برژانگەکانت وەک نەشتەر ئەچەقێنیتە دڵ و دەرونی زامارمەوە؟ تاکەی بە قسەی خۆش و بە خەندە ئەم نازدارە کەوا شێت و شەیدای باڵای بەرزتە، وێڵی زەردەخەنەیەکی لێوی ئاڵتە، بە تەفرەدان گرتووتە بە داوی دڵتەوە و کۆت و زنجیری دڵداریت خستۆتە ئەستۆ! تاکەی بە تەمابم دەستی دڵداریمان تێکەڵاو بکەین؟

من، ئەی یار! ئەو گوڵەی لە جیهانا، کە من ئاواتەخوازم بۆنی بکەم و ئومێد دەکەم پێی، ئەو نازەنینەی ئەمەوێ بێتە هاوڕێی ژینم و لە سایەی سێبەریا پشتێنی خۆشی بکەمەوە تۆی! تۆ پەرییەکی، بگرە فریشتەیەکی یەزدانی پاکیت و بەخشیوتی بە من.

ئەی یار، بڕوا بکە، ئەم وتارانە لە کانی دڵمەوە دێتەدەر، لە تۆ زیاتر یەکێکی ترم نییە دڵم پێی خۆش بکەم!

یارم، لە دەمێکەوە ئەم ئاوازە تەڕ و تازانە ئەدەی بە گوێما، هیچیشم بۆ نەهاتە دی! من ئەمەوێ تا چەپۆڵەی چەپگەرد لێمان دوورە و نەکەوتووینەتە دەریای ژینی تاریک و نوتەکی بە قەراغ و بەندەرەوە، تا ڕۆژی بەدکار لێمان نەئاڵۆزاوە و تەبیعەت لێمان نەتۆراوە! جوانترین ڕۆژی جوانیمان بنوێنین!

من، ئەی یار! بە هەموو دڵێکەوە چاوەنواڕی ڕۆژی بەیەک شادبوونم! بەڵام بۆ ڕێکەوتمان، بۆ ئەمەی لە پاشەڕۆژا بە هۆی خۆشەویستییەکی دورا و دوورەوە، کە لە نێومانا کڵپەی سەندووە تووشی گێرەوکێشە و دەردەسەری ژن و مێردایەتی

نەبین، پێویستە ئاگاداری هەندێ شت بیت، ئەمەوێ بزانم دڵداریەکەت لەپاش لێکدانەوە و تاقیکردنەوەیەکی قووڵی من، یان هەر لەسەر ئارەزووی منە؟

ئایا لە ڕەفتارمت کۆڵیوەتەوە تا بزانم بەگوێرەی دڵتانە؟! ئایا ئەگەر یەکێک لە من جوانتر، گەنج تر، کەوتە ناو شەپۆلی بێ سامانی دەریای لێکدانەوەتەوە، دەست لە دەستم بەرەڵا ئەکەیت و ڕەدووی ئەکەویت؟

ئایا ئەگەر تۆ لە هەموو ڕوویەکەوە دڵت بە منا چووبێ، دایک و باوک، یا کەسوکارت، بەرهەڵستی دڵداریەکەت ناکەن؟ ئایا لە هەڵبژاردنی یار سەربەستی؟ بەڵێ ئەگەر هیچ ڕێ ئامانجی تۆ نەگرێ، ئایا من هەروا ئەبێ بە کوێری لە ڕێی جوانی و لەنجەولارتا، خۆم توورِ دەمە ناو گێژی وەیشومەی پڕ ترس و ئەندێشەتەوە؟

ئەمەوێ وەک تۆ من تاقی بکەیتەوە، منیش لەخوو و ڕەوشتت ئاگادار بم. ئەمەوێ دانابێ، شیرین ڕەفتار بێ، هاوبیرم بێ، لە هەموو چورتوم و نالەبارییەکی ڕۆژگارا لە پاشەڕۆژا بێتە پشتیوانم. ئەمەوێ لە ڕێی گەل و نیشتمانا بۆ سەرخستن و بەرزبوونەوە، یان بەهەرچی چۆنێک بێ هەرچەندی بکەوێت لەسەرمان، یارمەتیدەرم بێ، لە هیچ بەشێک نەسڵەمێتەوە.

ئەی یار.. تا ئێستا کەسوکار، بە تایبەتی باوک و دایک شوورایەکی گەورەبوون لەناومانا، نەیان هێشتووە لەیەک ئاگادار بین . کەوابوو ڕیکەوتنمان زۆر گرانە!

یـارم.. وانەڵێی، ئەو ئاگرە بەرمەدەرە دەروونـم! گڕم تێ بەرمەدە چۆن؟ کێ ئەتوانێ بڵێسەی ئاگری ئەم دوو دڵە بکوژێنێتەوە؟ کێ ئەتوانێ ئەم دوو گوڵە لەیەک بکا و هەڵیان وەرێنێ؟ کێ ئەو بیری خۆی لە قەرەی پساندنی تەلی دوو دڵی بەیەکەوە نووساوی بەهێز، وەک من و تۆ بدا؟ کێ دڵی دێت ڕۆشنایی ئەم دوو چرایە لەناوا نەهێڵێ؟ کەس!

من .. ئەی یار، گریمان، ڕێکەوتین! کەس و کار ئارەزوومەند بـوون! ئایا وەک لەمەوپێش باو بـووە، بە جل و خشڵ و شایی و زەماوەندەوە زاوا ڕووت بکەنەوە و لە پەلوپۆی بخەن و ڕەنجی ساڵەهای لە دەست بەخت بکەن، تۆش یا کەس و کارت هەر لەسەر ئەو بیرە کۆنەن؟ ئەگەر واین هەر لە ئێستاوە نە بمدوێنە و نە ئەتدوێنم!

یارم.. بەخۆڕایی هەناوم بەرمەدەرەوە! گوێ لە یاری دڵسۆزی سەراسیمەت بگرە! من لە سایەی بێ هۆشی باوک و دایکمەوە لە خوێندن و لە بەردانی جڵەوی بیرم لە دەریای زانستیدا بێبەری بووم. وەک چوار پێیەک لە ماڵا بەسترابوومەوە. لە کاسە و کەوچک شۆرین زیاتر، ماوەی سەر دەرهێنانیان لێ بەستبووم، وەلێ غەمبارم بۆ هاوڕێیەکم لە دنیای ڕۆشن دا هەلی بژێرم، بەڵام هێشتا لە گرێی یەکەمی ژیانما بووم، باوک و دایکم لەگەڵ ئەو بیرە کۆنانەیانا نێژران. کەوتمە ژێرِ پەنجەی کەس و کارە دانا تازە پێگەیشتووەکانمەوە. بەهۆیانەوە کەوتمە هەڵیەنجانی زانست لە دەریای بێ پایانی زانستی دا، لە پێویستیم بەرامبەر بە ماڵ و منداڵ و مێرد و گەل و نیشتمان گەیشتم. تێگەیشتم چۆن منداڵم لە خوێندەواری فەرامۆش نەکەم، وەک باو باپیرمان ئێمەیان فەرامۆش کرد. فێربووم چۆن لەسەر ڕێی تازە پەروەردەیان بکەن بە ڕۆحی پیرۆزی نیشتمانپەروەری گۆشیان بکەم. بۆ ئەوەی ببنە نۆکەرێکی ڕاستەقینەی نیشتمان نەک وەک ئێمە بە هۆی دایک و باوکمانەوە بوینەتە دومەڵێکی داڕزاو لە لەشی نیشتمانا. ئەوەش باش بزانە نەک من، هەموو کچێکی تێگەیشتوو پێی خۆشە، تا پێی بکرێ دایک و باوکی ئەخاتە سەر ئەو ڕێیەی کە بە کراسی بەری خۆیەوە بدرێت بەو گەنجەی دڵی پێیەوەیە. چونکە مراز لە ژن و مێردایەتی خۆش ڕابواردنە، خۆش ڕابواردنیشمان بەوە نایەتە بەرهەم، بەری ڕەنجی ئەو گەنجەی شووی پێ ئەکرێ، بدرێت بەدەم ئاوەوە و خێرا لەناو ببرێ. وە یا هەرچی بەدەستەوە هەیە، بۆی بدات بە جل و خشڵ و لە دواییشدا لەناو شەپۆل و قورتی قەرزداریدا بناڵێنن. تا ئەو خشڵانەی دوێنێ بۆی کردبوو ئەمڕۆ بەنیوە قیمەت بیخاتە هەڕاجەوە و بیفرۆشێ و پارەی خەڵقی لێ بداتەوە، من لەو کچانەم دڵم بە ماڵ و مێردەوە ئەسووتێ، سەرەڕای ئەوەی مەیدانی دەستبڵاوی مێرد نادەم کە لە ڕێی منا پەلوپۆی خۆی بشکێنێت، بیری تەقەلاش ئەدەم بۆ خۆش گوزەرانیمان لە ئیش وکارا یارمەتی بدەم و سەرە گۆریسێکی لەگەڵا بگرم. بەڵام ئاخ لەم گفتوگۆیەدا بووین، ناکا یەکێک وەک بای شەماڵ بەسەرا هات، نەپەرژاین کۆتایی بە سکاڵاکەمان بدەین، هەریەک لە عاستی خۆمان بە تیلایی چاو دوعامان لەیەک خواست و کەوتینە مل ڕێی هەناسە هەڵکێشانی سارد و لێکدانەوەی ئەو برینانەی لەسەر ڕووی دڵمان جێگیر بووبوو.

لە دەروونی گەرممانەوە، تیرمان ئەگرتە ڕۆژگار، کە نەیهێشت ئەم دوو سەرگەردانە بگەنە نیازی دڵی هەڵقرچاویان.



# من و یار



جووتمان گرتووە. بەڵام مەپرسن لە کوێ؟ خۆمان و گەنجایەتیمان یەک بەیەک پێ ئەکەنین، لە من ئاهەنگی خۆشەویستی، لەو تەریب و تەقەڵی پێگەیشتن. بەیەکمانا ئەخوێند، هەر مەپرسە بوو. بەم باسوبەرباس لەگەلێ ئاوماندا، بەگەلێ لوتکەدا هەڵگەڕاین. لەژێر سێبەری زۆرداریدا عارەقی ماندوویەتیمان سڕی. هەر چووین و هەر هاتین، تا بەرەنگاری ڕەشماڵی پەچەی گێرەشێوێن بووین. من حەزم لەچارەی نەدەکرد، بەڵام چۆن پێوەبووم؟ نازانم دیارە ئەگەر بڵێم لەبارەوە بوو، بڕوا ئەکەن. چونکە هەموو مەیلمان لەسەر مەیلی یارە. خۆتان ئەیزانن، گۆبەنگ و نەریتی پەچە، هەروا بە ئاسانی نابڕێتەوە و سەرتان نەیەشێنین، جارێ فەرموون ئەم چمکەی هەڵدەنەوە:

هەر کە زانیم لە درزێکی پەچەوە ئالام، چارم نەما، زۆر و کەم بەسەرو پۆتەلاکیا هەتمە خوارێ. ئەوجار ئاگری گرت فەرمووی:

یار:

بەزمەکەیە، هەر وتم ئەم بەنگ و باوە ڕۆژێک یەخەم ئەگرێتەوە. گیانەکەم، ئەم پریاسکە توند و تۆڵەی بن هەنگڵتان. ئەم بنێشتە خۆشەی ژێر زمانتان، لە خۆیا زۆر کەمە، بەڵام تایی لێکۆڵینەوەی ئەوێ. دیارە تۆ ئەڵێی نەپۆشینی باشترە و منیش

ئەڵێم پۆشینی، لەوە زیاتر هەندێ کاروباری ژن ورد بکەینەوە، ناوبژیکەرمان نییە. جا کەوابوو با هەر لە خۆمانەوە هەڵکوتینە سەر (پێویستی- واجبی) ژن.

ژن، بێجگە لە هەڵسوڕاندن و ڕێکوپێکی ناوماڵ، کە نیرگەی بەختیاری ژن و میردایەتییە، چوار پێویستی تریشی هەیە:

1.منداڵ هەڵگرتن (**حمل**).
2.منداڵ دانان (**وضع**)
3.شیردان (**ارضاع**).
4.بەخێوکردن (**التربیه**).

ئەگەر ئەمانە پێویستی ژن بێ و بە یەکەم مەکتەب، یا بەو کارخانەیەی دابنێین کە چەک بۆ وڵات دروست ئەکات، ئیشی بە هاتنە دەرەوە نییە، مەگەر لەبەر کارێکی زەروری نەبێ. وەکوو خوا ئەفەرمووێ:"**وقرن فی بیوتکن ولا تبرجن تبرج الجاهلیه الاولی**" و هەر وەکوو پێغەمبەریش ئەفەرمووێ: "**المرأه عوره وانها اذا خرجت من بیتها استشرفها الشیطان وانها لاتکون اقرب الی الله منها فی قعر بیتها**" و هەر وەکوو (تۆلستۆی) لەم ڕووەوە فەرموویەتی: "پیاو هەوڵ و تەقەلایان وتووە. ئافرەتیش ماڵ بەجێ نەهێشتن، چونکە ژنە. یا شووشەیەکی بێگەردی ئەوتۆیە کە لە شکان و پیس بوونەوە زۆر نزیک بێ، پیاو ئەبێ چاودێری ڕەفتاری ژنەکەی بکا، جڵەوی بۆ بەرەڵا نەکا، ئەبێ لە ماڵا بیشارێتەوە، چونکە ماڵ هەرە فرەوانتری دائیرەی سەربەستی ژنە".

بەڵێ، ژن لە هاتنە دەرەوە، با پەچەش بپۆشێ، خۆ سوودی بۆ کۆمەڵ دەبێ، خراپەی هەر نییە.

بەڵێ ئەڵێی ئەگەر ژن هەر لە ماڵەوە ترنجا نە خوێندەوار دەبێ؟

لە لۆمە نەترسامایە، فەزلی ژنێکی نەخوێندەواری ئەمین و عاقڵ و سەلارم ئەدا بەسەر هەموو ژنێکی دانا و چاو لە دەر و توورە و ترۆدا و قسەی (ملتن) و گەلێ لە حەکیمەکانم ئەهێنایەوە کە ڕێگای فێربوونی ژنانیان نەداوە.

بەڵێ، ژن ئەبێ خوێندەوار بێ، وەکوو پێغەمبەر فەرموویەتی (**العلم فریضه علی کل مسلم ومسلمه**)، بەڵام پەچە ڕێی فێربوونی ناگرێت، لە ڕێگاوبانان و کوڵانان دا عیلم بڵاوکراوەتەوە بچێنرێتەوە. ژنیش هەر لە ڕێگاوباندا پەچە ئەگرێتەوە. پەچە هیچ دەخلێکی بەسەر عیلم و پێشکەوتنەوە نییە. ئێوە ئەڵێن: نیرگەلی



وریابوونەوە سفورە، بەڵام ئایا تەنها سفور کافییە؟ کام ژنە لادێیی پەچەی هەیە؟ کوا پێشکەوتن و کوا وریا بوونەوەیان؟ ئەگەر ئێوە پێشکەوتنتان بە پەچەوە بەسترابێ، پرسی پێ ناوێ وا تورمان دا. بەڵام ئێوە کە پیاون و بەرەڵان، چیتان کردووە و چیتان لەبارە؟ کوا ئەو مەکتەبانەی تامی تامی ئێمەی پێ ئەدەن و ئەڵێن ئەگەر پەچەتان نەبێ ئەبنە دکتۆر، محامی، موهەندیس؟ کوا کارخانەکانتان؟ هەر پەکتان لە ئێمە کەوتووە؟

من و تۆ ئەڵێین پۆشینی پەچە باشترە لە نەپۆشینی. کەوا بوو ئەتەوێ زەهاوی بە درۆ بخەیتەوە کە ئەڵێ: پەچە سەنگەری چاکە نییە، ئاگر تیژکەری خراپەیە. ژنێکی بێ پەچە ئەگەر لە زڕانی ناوی بترسێ، سەر بە هەموو شوێنێکا ناکا، خراپەی لە دواوە بێت. نەوەک بیبینن و بیناسنەوە و بڵێن ئەوە کچ، یا ژن، یا خوشکی فلانە. بەڵام ئەگەر پەچەدار بوو، لەوە ناترسێ، کوێ ئارەزووی بکا سەربەستە و ئەچێ".

یار.. پەچە نە خراپ ئەگۆڕێ نە چاک. ئەگەر بڵێین ئێوەش ڕاست ئەکەن. شاز نابێتە قاعیدەیەکی عام. چونکە ئەو خراپەکارانەی ئێوە ئەڵێن ئەگەر پەچەیان لاداوە ئەبێ چاک بن لە خراپەدا، هەنگاوی گەورەتر ئەنێن.

تۆ، ئەتەوێ بڵێی ژن ئەبێ هەر لە ماڵەوە بێ و چاوی لە دەستو مووچەی پیاوەوە بێ؟ وانا؟

یار، پیاو و ژن کولەکەی ژیانن. پیاو ئیشی خۆی هەیە و ژنیش ئیشی خۆی، نابێ کەسیان دەست بکێشنە ئیشی کەسیان. پیاو لە زۆرزانی ژن و ژن لە هێزی پیاو ئیستیفادە ئەکات. کە هەردووکیان یەک بەیەکەوە ئاڵاون. ناڵێم ژن ئیش ناکات. بەڵام پەچەش مەنعی ناکا، ناڵێم لە ماڵی خۆیا ئیش نەکا و لە مەکتەبەکانا (ئەگەر دەستی بەپرژێ) منداڵ پێ نەگەیەنێ، بەڵام نەک بیان ترنجێنە گێژاوی مەئموورییەت و کاروباری تیجاری و سەناعییەوە. چونکە نەهێزی بەوە ئەشکێ، نە بۆ ئەوەش لە دایک بووە. (ڕۆسۆ) ئەفەرمووێ: "ژن نە بۆ عیلم هاتۆتە دنیا، نە بۆ لێکدانەوە، نە بۆ حیکمەت، نە بۆ فەن، نە بۆ سیاسەت. تەنها بۆ ئەوەیە دایک بێ. خۆی و منداڵەکانی وان بە ئەستۆی پیاوەوە". هەموو ڕۆژهەڵاتنێک دەبێ بزانێ کە بە شەرع و عەقڵ و عادەت، پێویستە پیاو سەرپەرشتی ژن بکا. وەکوو خوا ئەفەرمووێ "الرجال قوامون علی النساء" و مەیدانی تێکەڵاو بوونی لەگەڵ پیاودا، نە وا لە کارخانە و جێگا عموومیەکانا، وەکوو پێغەمبەر فەرموویەتی: "علموهن انعزال و لاتجلسوهن الغرف". ئەگەر هات و ژن وەکوو ژنەکانی ڕۆژئاوا تاوی دایە ئیش و کاری پیاو لە ژنێتی ئەکەوێ. بەختیاری ماڵ و منداڵی ون ئەکا. مەعنای ژن و مێردایەتی تێدا ئەچێ (سامویل سمایلیس).

ئینگلیزێ ئەفەرمووێ: "ئەو دەستوورەی ژن ئەخاتە ئیشەوە لە کارخانەکانا بۆمبایەک دروست ئەکات، خانووی کۆمەڵی پێ وێران بکات".

من، دیارە لە حەق داواکردنتان پاشگەز نین، ئەتانەوێ سەربەست بن. کەوابوو بۆچی دیلی پیاون و بەرامبەر بەزۆرداریيان سەر هەڵنابڕن؟

یار، ئەمانەوێ سەربەست بین. بەڵام سەربەستی ئەو ژنانە نا، کە دەوڵەتی ڕۆمان، عەباسییەیان سەرەو ژێر کرد، یا وەک ئەو سەربەستییەی ژنانی ئێستای ئەورووپا نا، کە زاوزێی شەرعییان لە ناوا نەماوە، چونکە سفوور و داوێن پاکییان نەوتووە. ئەو سەربەستییەش نا، کە فڕانسەی تووشی سەرگەردانی کرد.

من، تۆ ئەگەر باسی ژێرکەوتنی فڕانسە بدەیتە پاڵ سەربەستی ژن، خۆ ژنانی هەموو ئەورووپا و ئەمریکا سەربەستن. کەوابوو بۆچی هەر لە پێشکەوتنان؟

ئەڵێی سەربەستییەتی ژن نرخی زاووزێی شەرعی بەلادا نییە، کۆمەڵێکی بێ زاووزێی شەرعی دیارە تا بێ ڕۆڵەکەم بۆ ئەوەیە چونکە نەخۆشی لە ناوا تەشەنە ئەکات و مەیدانی گەشەی ساوایانی نادات. بەڵام ئەورووپای ئێستا کە ژنی سەربەستە خۆ ژمارەیان تا دێت هەر لە زۆرییە، کەوابوو زاووزێی شەرعی، یا غەیری شەرعی، بە سفورەوە نەبەستراوە. ئەڵێ سفور و داوێن پاکییان نەوتووە؟ ئەی حیجاب و داوێن پاکییان وتووە؟ کە لەژێر ئەو پەچەیەدا هەرچی نەشێ ئەکرێ؟

بەڵێ باشە، وا زانیمان ژن ئەبێ ئیش بکات، فێرببێ، پەچەش بپۆشێ، بەڵام ئایا بێ پەچە باشتر نییە؟

یار، ئەتەوێ بڵێی پەچە حەرام نەکراوە. چونکە ئاگات لەوە نییە کەوا فەرموویەتی: "واذا سالتموهن متاعا ما ستلومن من وراء الحجاب" و یا دیسان فەرموویەتی "یا ایها النبی قل لازواجک وبناتک ونساء المؤمنین علیهن من جلابی. هن ذلک ادنی ان یعرفن فیؤذین"

ئەتوانی بڵێی حەرام کردن و نەکردنی پەچە، دراوەتە دەست زمان و عەقڵ و عادات و زەرورەت، نەک بڵێی حەرام نەکراوە. من لەوانەم بڵێم دەست و ڕوو دەرخستن، جائیزە وەک لە نوێژا هەیە، بەو شەرتەی فیتنە و خراپەی بە دوادا نەیە (کە ئەمەش هەرگیز ڕێک ناکەوێت، چونکە هەموو ئینسانێک فریشتە نییە" ژنیش خۆی ئەپارێزێتەوە بە ئەنواعی پۆدرە و دەست بەخۆیا ئەهێنێ، ئەو خۆ ڕازاندنەوەیەی دڵ ڕەقتر یا هەرە ئیمان دارتر، پیاو بەرەو

عەبدوڵڵا جەوهەر





فیتنە ئەبات، وەکوو خوا فەرموویەتی: "ولا یبدین زیتهن الا ما فرض الا لیعولهن اولا با" و هەر وەکوو پێغەمبەر فەرموویەتی: " ایما امروة استعطت ثم خرجت فمرت یقوم لیجدوا ریعها فهي زانیة وكل عین زانیة".

لەوانەشم ( وەکو زۆر لە دانایان ڕێیان داوە) بڵێم، هەژار و ئیشکەران، بێجگە لە دەست و ڕوو، قاچیشیان دەربخەن. بەو شەرتەی بەهۆی ڕێدانی دەرخستنی دەست و قاچ و ڕووەوە، هیچ جێگایەکی تریان دەرنەخەن کە شەرع ئەمری دەرخستنیان نادا. ئەویش لەژێر چاودێرییەکی زۆر وردا، چونکە نواندنی تساهول ئەبێتە هۆی ئەمەی ڕۆژێک ژن خۆی بەرەڵڵا بکا. ئەمە ئەڵێم و ئەڵێم، ژنی ئەم ناوچەیە بە گوێرەی خوو و ڕەوشتێ کە لە کۆنەوە بۆمان ماوەتەوە، شارییەکان بە ڕووپۆشین و لادێییەکان بە ڕوونەپۆشینەوە خویان گرتووە. کەس تا ئێستا بە ڕووی لادێییەکانا هەلکاڵیوە بۆچی پەچە ناگرێتەوە؟ یا دەست و قاچت دەرئەخەی؟ ئێوە بۆچی ڕێگاتان بە عادەتێکی کۆنی ئەم ناوچەیە گرتووە کە بەربەستی هیچ کاروبارێکتان ناکا، ئیشە بۆتان ئەکەین،ماڵە بۆتان هەڵ ئەسووڕێنین، منداڵە بۆتان بەخێو ئەکەین، گوایە ئێوە ئەوەندە دڵسۆزن، بەزەییتان بە دیلێتی خوشکەکانتانا بێتەوە؟ گەر لای خۆتانەوە ئەوان بەدیل بزانن، لەوان دیلتر، لەوان کەساس تر، لەوان بێ دەسەڵات ترن؟ ئێوە حەسوودی بەو ژنە گاورانە مەبەن کە هەمیشە شان بەشانی مێردەکانیان ئەم لاو ئەو لا ئەکەن. و لە هەموو کۆبوونەوەیەکا حازرن. ئەو تەرحە مەزهەرانە هەڵتان ئەخەڵەتێنێ، چونکە هیچ گومانتان نەبێ، هەر کە گەیشتنەوە ماڵێ، یەک بەرامبەر یەک ئەوەستن. لەیەکتر ئەبنە حاکم. موحاکەمەی ئەو تەماشاکردن و زەردەخەنە و گفتوگۆیەی یەکتری ئەکەن کە لە ڕووی یەکێکی تردا نواندوویانە.

ئەگەر ئەمە حاڵی ئەوانە بێ کە لە باب و باپیریانەوە سفوریان بۆ هاتبێتە خوارەوە، ئەبێ حاڵی ئێمە چۆن بێ کە لە پڕ، لەم تەنها باڵی ژێر پەچەیەدا، باز بدەینە ئەو دەریا بێ پەیەوە؟

یار: مامۆستا (فرۆید ) ئەفەرمووێ: ئەگەر جڵەوی مێرد هەڵبژاردن بدرێتە دەست ژن، پەشێوی گەورە گەورەی کاریگەر لەناو کۆمەڵا بەرپا ئەبێ".

تۆڵستۆی ئەفەرمووێ: سێ مەسئەلەی تەڵاقدان، کە ئەورووپای خەریک کردووە، بەری ئەو مەدەنییتەیە کە ئینسان لە کەرێتی و چاو لە دەری و داوێن پیسی زیاتر هیچی تری لێ وەرنەگرتووە. زۆر بەسەر شووکردنی ژنێکا ڕانابوردرێ، بەرامبەر بە مێردەکەی ئەوەستێ و پێی ئەڵێت، بە جێت ئەهێڵم و لەگەڵ فلانە کەسی خۆشەویستما ئەڕۆم، چونکە ئەو لە تۆ جوانتر و لاوچاک ترە، ئەمەش بۆچی؟ چونکە بەدەم ژنەوە دراوە و ئەویش شووڵی لێ هەڵکێشاوە و شیرازەی ملکەچێتی مێردایەتی پساندووە، ئەو ملکەچێتییەی کە پێویستە تا مردن لێی لا نەدات". گەیشتینە ئێرە و پێیان برین -خوا چاکیان بۆ بکات- پەردەی خۆشییان پێ داینەوە بەسەر پەردەی پەچەدا.



# نیشتمانپەروەر



ئێمە کە ڕۆڵەی ئەم ناوەین، لامان وایە هەرچی پیشی سوورە هەمزە ئاغایە. هەرچی هات و زمانی لووسی لێ خستینەکار، ئەگەر دوژمنیشمان بێت، بێ تاقیکردنەوە ئەچینە سەر بیری و ئەبینە گورزی دەستی. هەرچی هات و بەرامبەر گەل و نیشتمان، دوو باسی ڕەنگینی بۆ کردین، بێ ئەمەی لە ڕەفتاری بپرسینەوە، یەکەن دەرد و ئەڵێین ئەمە ڕۆحی پاکەو دڵسۆزی نیشتمانە، لە ڕەوشتی ورد نابینەوە و نازانین کە نیشتمانپەروەر ئەو دلاوەرییەیە، بە ماڵ و بە گیان تەقەلا بدا و درێخی نەکات لە ڕێی دەرهێنانی گەلیا لەژێر پەنجەی بێگانە، بۆ مەیدانی ئاسوودەی، نیشتمانپەروەر، ئەو جوان سیرەیەیە شەو و ڕۆژ سرەوتی نەبێ بۆ زیندووکردنەوەی حەقێک کە لە ئەزەلەوە بۆ گەلەکەی براوەتەوە و ئێستا لێی بێبەرییە.

نیشتمانپەروەر، ئەو بێچووە شێرەیە، خۆی لە هاوخوێنا پێ بڵندتر تەماشا نەکا و حورمەتی هەموو هاوزمانێکی بگرێ و بەچاوی سووک نەڕوانێتە کەس، ئەوانە نەبێ کە ئەبنە دومەڵێکی داڕزێنەری گەل و نیشتمان، نیشتمانپەروەر ئەو ڕۆڵە چالاکەیە، هەمیشە خۆی لە خراپە دوور ئەخاتەوە و هانی هاووڵاتییەکانی ئەدا بۆ ئیشی چاکە. نیشتمانپەروەر، ئەو پاڵەوانەیە پێویستی ناخاتە پشت گوێ و دەم و دڵی یەکە. لەبەر ئەمانە ئەبێ بەسەرزاری بە چاک و خراپ، حوکم بەسەر کەسا نەدەین و لەم قەڕنی بیستەمەدا بە قسەی خۆش و بە خەندە تێ نەکەوینەوە، و ئیشمان نەدەینەوە دەست نەزانکاران.

# ناڵەی هەژارێك

عەبدوڵڵا جوهەر





ڕۆژێک سەر لە ئێوارەی زەردەپەڕ، لەگەڵ شنەی شەماڵا، بە سەر تارای ئاڵ و واڵای خاکا، بەبۆی گوڵێکی شەوبۆوە. بە ئاواز و چریکەی مەلانەوە، لەگەڵ یاری بەسەد جل ڕازاوەما، بە چوونە، لەنجەو لار، بە مەبەستی بەستەی خانم خاسەوە دەست لەملان و لێو بە کوڵمی ئاڵەوە، بۆ گەشت و بە بادانی خەم بەرەو باخێ ڕۆیشتین، باخی ئیرەم لە چاویا دەشتی کرکای کرک بوو. لەپاش گەڕان و نۆشینی بادەی مەستی، لە گەڕانەوەمانا لەسەر کانی و ئاوێ، لەژێر دارگوێزێکا، بەرامبەر بە بێشەیەک، بەرەنگاری کوردی پۆلێک لە خانم نازان بووین، وەک قومری و بولبول، لە گوێ ئەو ئاوە نیشتبوون. هەر یەک بە ئاوازێ گریی غەمی هۆنراوەی دڵی کڵۆڵیان ئەڕەوانەوە. لەسەر فەرمووەدیان لاماندا، بە دڵێکی گەرمی دڵسۆزانەوە، خۆش هاتنیان پێشکەش کردین.

ئێمەیش لە پاڵ تیلایی چاوی گوشینی مەماندا، کۆمەڵمان هێنایە جۆش و خرۆش. زۆری نەخایاند، بەتاو پۆلێ وەک هەڵیان کوتایە سەر ئەو ئاوە، کە هەستیان بە ئێمە کرد، بە شپرزەیی جلەویان بادایەوە. لەمەدا یەکێکیان لەناو توترک و بێشەکە وا گیری خوارد. هەر چەند پەلەقاژەی کرد و خۆی پێ ڕزگار نەکرا. دووبارە ئێمەش ماوەی ئەوەمان نەبوو بەرەڵای بکەین. زۆری پێ نەچوو چەند مەلێک بەسەریەوە پەیابوون، بەبێ سوود هەرچییان پێکرا دریغییان نەکرد. ئەوەندەمان زانی یەکێکیان دای لە شەقەی باڵ و ڕۆیی، جگەرەکێشانێکی نەبرد، بە خۆی و پۆلێک لە هاوڕێکانیەوە گەڕانەوە. ئێمەش هەروا سەرنجیان ئەدەین. چارەکێکی پێ نەچوو، توترکەکەیان ونجڕ ونجڕ کردو هاوڕێ ئازیزەکەیان لەو تەنگییە ڕزگار کرد.

تا ئەم کەین و بەینە کرا، پێشەنگی تاریکی شەو لوتی کێشا، زەمینی گرتە باوەش. ئێمەش بە دڵگوشادی و بەسەندنەوەی بەستەی تەڕ و تازەوە، بەسەر خامۆشیی شارا، هەریەک بەرەو ماڵ بووینەوە، بەڵام کاروباری ئەو پەلەوەرانەی منی بێ چارەی سەرسام کرد و کردەوەکانیان لە مێشکما هەر ئەهات و ئەچوو.

شەو کردی و من کردم بە لێکدانەوە و گینگڵم دا، تا تاریک و لێڵی بەری بەیان. هێشتا ئەستێرەکان جریوەیان ئەهات و مانگ بۆ پێشوازی ڕۆژ لە کڕنووشا بوو، وا ڕێکەوت بەناوی چوونمەوە بۆ مزگەوت لە کوچەی کۆڵانێکا، دەنگی یەک پەریزادی ناسک و نازدار، کە زلینما لە پەرێزیا هێشووی نەدەکرد هاتە گوێم. بە مناڵێکی ساواوە ئەگریا و ئەیناڵان. ئەو دەنگە غەمبارە پڕ دەردە کە لەدڵی هەڵقرچاوی ئەو نازەنینەوە بەر شنەی سۆزی بەیان ئەکەوت، لە گوێما زرنگەی ئەدایەوە، سەرتاپا ئاگری تێبەردام و هەناوی لێ بڕیم و قەڵەمی ئەژنۆی شکاندم، بەڵام بە زۆر و بەتەکان خۆم بە کێش کرد تا دەمم گەییە دەمی. لێم پرسی خۆشکی شیرینم بۆچی ئەگریت؟

بە کوڵی گریانەوە وتی: برای دڵسۆز، کاکەی نەوجوان، چۆن نەگریم؟ چۆن نە ناڵێنم؟ من کە کچە کوردێکم و لە پێناوی کورداندا کەسوکارم سەریان نایەوە، ئێستاش داماو و سەرگەردان و بێکەس ماومەوە. ئەمە چەند شەوە و چەند ڕۆژە بێ شێو سەرئەنێمەوە، سەدان لە هاوخوێن و هاوزمانەکانم بەلاما ڕائەبوورن و گوێیان لە ناڵەی خۆم و ئەم جگەرسوژەم بووە، کەسێکیان ئاوڕم لێ نادەنەوە. چۆن نەگریم؟ چۆن نەناڵێنم؟ چۆن لە تەختوبەختی چەپگەرد نەنەوێم؟ چۆن بە ئاە و ناسۆری دڵی پڕ دەردمەوە، گڕ بەرنەدەمە گەردوون؟

ئینجا ئەی برا، ئەی خوشک!

کەمێک سەرنج بدەنە ڕەفتاری ئەو مەلانە و پیشەی خۆشمان بەراورد بکەن. ئەو پەلەوەرە بێ کارانە، هاوڕێکەی خۆیان فەرامۆش نەکرد تا ڕزگاریان کرد، بەڵام ئێمە بەو جۆرە بێکەسی لە کۆڵانەکانا بێ یار و هاودەم، بێ بەرگ و خۆراک، بەتینی خۆری چلەی هاوین هەڵئەقرچێن و لە برسا وەک داسک و دەرزییان لێهاتووە، لە پیسییدا ئەسپێ داویەتە کالانەی چاویان، وەک کەڕ و کوێر و لاڵ، بە لایانا تێ ئەپەڕین، وەک ئینسان نەبن یا هاوخوێن و هاوزمانمان نەبن، بە تەنگیانەوە نین و فریای هیچ دەردێکیان ناکەوین.

برا گیان!

توخوا، ئەمە شەرمەزاری نییە، لەم چەرخی بیستەمەدا هاوخوێنەکانمان لەبرسا بمرن و لە پیسییدا برزێن، کەسێکمان نەچین بە هاواریانەوە؟



